شیعر

# ژیلەمۆی ئاگردانی غوربەت

هێرش محمود سەنگە سەری

چاپی یەکەم

١٩٩٩ ١٤١٩

بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەکی:

ئـەدەب بەگشـتی و شـێعر بەتایبـەتی، ڕەنگدانـەوەی هەسـت و بـیری نوسەرەکەیەتی و ئەو ڕەنگدانەوەش بە هەڵکشان و داکشانی ڕووداوەکانی دەوروبەرەوە بەندە.. جا ئەگەر شێعر لەنێو میللەتانی خاوەن ماف و کیاندا تەنها بۆ زاخـاوی مێشك و مشتومالّ کردنـی دلّ و کـات کوشـتن بـێ ئـەوە شێعری کوردی وەکو گەلەکەمان وا ڕاهاتووە سەرسەخت و یاخی و چیازادە بێ و بست بـە بست لـە سـەنگەری بـەرەنگاری جیانەبێتـەوە. ئـاخر لـەنێو گرمەی تۆپ و ڕاجیمە و گرەی فرۆکە و هارەژنی زەمین بەزەمین و دوکەڵی جۆرەها کیمیاییدا، هەر شێعری ژان گرتوو و یاخی و ڕاچەنیو و نوور پـێی دەکرێ چاوی بوون هەڵێنێو، لە ژێر باری قورسی ئەو هەموو مەرگەساتانەوە سەربەرزکاتەوەو لەداگیرکەران ڕاسێ و پڕ بە گەرووی بەڕوویاندا بقیژێنێ..

تەنانەت ئەو کاتانەش کە گەلەکەمان تووشی هەڵەنگوتن و نووچ دان بووە و گێژی بە سامی ئاشبەتاڵ سەرگێژەکەی نـاهومێدیی گـەیاندۆتێ و تفـەنگ سـەری خەجاڵـەتی بەرداوەتـەوە و سـەرەوبن دەشـانی کـراوە و قەرەقـەپی لـێکردووە شـێعری بـەرەنگاری وەکـو گـڕی نـەورۆز لـە شـەقام و دونـد و بستووەکانی کوردستانەوە بینراوە و ئۆخژن و هیوای دە دڵی خەڵك گێڕاوە و هەر پێشمەرگە بووە و هەرگیز چەکی فڕێنەداوە.

هەڵبەتە لەدواییانـەدا لـەبواری شـێعری بـەرەنگاریی ئیسـلامی کوردیـدا تاکوتەرا لێرەو لەوێ شێعری چاك هەر وەبەرچاو کەوتوە بەلام هیچیان لە چەندایەتیدا نەگەیشتوونەتە شێعرەکانی مامۆستا (کرێکار)، بۆیە لەم ڕووەوە ئەو بە پێشەنگ و سەرمەشق دادەنرێت.

بڵاوبوونـەوەی (ژانـی بـوون) گۆمـی مـەندی بێدەنگـی کـەم دەنگیـی شـاعیرانی مسـوڵمانی کـوردی شڵەقاندو، بوو بـە هـەوێن و چـەندەها شـێعری ڕەسـەنی مـەیاندو لـەو ڕووەوە گۆڕانکارییـەکی گـەورەی بـەرپاکرد و خـەون و خـەیاڵی چـەند سـاڵەی ڕۆشـنبیرانی کـوردی بەرجەسـتەکرد. زۆری پێنـەچوو لـە هـەموو لایـەکی کوردسـتانی باشـوورەوە لاوانی قەڵەم بەدەسـتی موسـوڵمانـی کورد وەخۆ کـەوتن و

قۆڵیـان لـێ‌هەڵکردن‌و چـەندەها پشـکۆی سـووری شـیعری بـەرزیان خسـتە سەرکوانووی ئەدەبی شۆڕشگێڕی کوردی .

بێ‌گومان چەندەها ساڵە گەلی کورد لە سۆنگەی زۆر دەستەیی‌و بێ‌ئالایی‌یەوە پشتی وەکێوی سەختی شۆڕش داوەو کاروانی بەرەو خۆری بە ڕێبازی خوێن‌و شارەقدا وەرێ کردووە ، جا شیعری بەرەنگاریش بەشێکی گرنگە لە تونێشـووی ئەو ڕێگا دوورەو کاک ( هێرش )ی لەمەڕ خۆشـمان یەکێکە لـەو لاوە مسـوڵمانە شۆڕش گێڕانەی چەندان ساڵە هەر لەو سەنگەرەوە کە بەرگری تێدا لە چەوساوان دەکات ، گوللە بە دوژمنەوە دەنێت ، ژان‌و ناسۆری گەلەکەی دەکاتە چەخماخەی ڕەهێڵەی شیعری بەرەنگاری‌و داگیرکەرانی پێ‌ڕەجم دەکات .

شیعر هـەر بۆخـۆی سـیحرو حیکمـەتێکی وای تێدایـە هـەر هەسـت‌و سـۆزو مەبەسـتێك بچێتە نێو جوغزی‌یەوە ، پلەوپایەی بەرز دەبێتەوەو خوێنی شـیرین دەبێت‌و لە شتی دی پێهەلاتر دەچێت ، ئەدی ئەگەر ئەو شیعرە ئێش‌و ئازارو خـەم‌و خەونی ملیۆنان کۆیلە وەخۆگرێ ، دەبێ چەندە پیرۆز و لەبـەر دڵان بـێ‌و شان لە شانی کامە دوند بدات ؟!

ئـەم کۆمەڵـە شـیعرەی کـاك ( هـێرش )یـش لـە سـەنگەری بەرەنگاری‌یـەوە تروسـکەیان دێ‌و تەنانـەت شـیعرێکی وەکـو ، بـەهارو مێرغوزار )ەکەشـی — بـۆ نموونە — کە وەسفی سروشت دەکات ، ئەوە مێلاقەو گوڵاڵە سـووورەکانی هـەر لەبەرۆکی شۆڕش‌و ڕاپەڕین و یاخی‌بوون دراون‌و گیابەند ئاسا لە ڕەوەزەو ماهی سەختی خەباتی خوێناویدا ڕواون .

ئەم شیعرانە سـەرباری ئەوەی کە بەرهەمی نێو سەنگەرن ، زۆریش ناسك‌و ڕەوانـن‌و بـە زمـانێکی پـاراو نوسـراون کـە هـەموو خـەڵك تێیـان دەگـات‌و مەبەستەکانیان سادەن‌و نەخراونەتە گەرووی حەزیای تەم‌ومژو ڕەمزی ناقۆڵای بێ‌جێ و سەر لێ‌شێوێن .

ئەوەی جـێی سـەرنجە ئەوەیـە کە ئەم گوڵە شیعرانە لە کـاتێکدا بـە یەخـەی شـۆڕشی ئیسـلامی کوردسـتانی باشـووردا دەکرێـن کـە بیروبـاوەری قرپۆکـی مارکسیزم لە سەرانسەری جیهاندا بازاڕی شکاوە . ئەوەش بۆتە هۆی ئەوەی ئەم شیعرە ئیسـلامیانە هێنـدەی دیکە ڕەمێن پەیدا بکەن‌و بکەونە بەر دڵـی کۆمەڵـی

ڕەش‌ورووت‌و چەوساوە بە هەموو چین‌و توێژەکانیەوە و خەنیمێك نەبێ لە بەرانبەریاندا سەر هەڵێنێ ... !! بە ڕاستی هەر دەبێ واش بێ ، چونکە چەندەها شاعیری نامسوڵمانمان دی لە لوتکەی خەبات و یاخیبوونەوە خۆیان هەڵداشتە نێو شیوی هەزار بە هەزاری ڕامووسینی دەست‌و پێی زۆرداران‌و داگیرکەرانی هەژارکوژو ( زنێرە ) ئاسا دەستیان بە ماستاو کردن‌و پێهەڵگوتنی زوحاکی کورد کردو بەرگی مووسایان دەبەر فیرعەون کرد ...

بەڵێ تەنها شێعری ئیسلامی‌یە کە هەرگیز کڕنوش نابات‌و هەر سەربەرزو ڕوو سوورەو لە دووڕوویی‌و چاوبەست دوورە و تا شەهید بوون یان سەرکەوتن سەنگەر چۆڵ ناکات ... هەر لەبەر ئەوەشە خوای گەورەو کاربەجێ تەنها شاعیرانی مسوڵمان و باوەڕداری لەو شاعیرانە هەڵاواردوە کە گومڕایان وە دوایان دەکەون و گوفتارو کرداریان تێك ناکەنەوە ﴿ وَالشُّعَرَاءُ يَتَّبِعُهُمُ الْغَاوُونَ (٢٢٤) أَلَمْ تَرَ أَنَّهُمْ فِي كُلِّ وَادٍ يَهِيمُونَ (٢٢٥) وَأَنَّهُمْ يَقُولُونَ مَا لَا يَفْعَلُونَ (٢٢٦) إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَذَكَرُوا اللَّهَ كَثِيرًا وَانْتَصَرُوا مِنْ بَعْدِ مَا ظُلِمُوا وَسَيَعْلَمُ الَّذِينَ ظَلَمُوا أَيَّ مُنْقَلَبٍ يَنْقَلِبُونَ (٢٢٧) ﴾ . سورة الشعراء

کتێبخانەی هەژاری کوردی لەمێژە بە عەزرەتەوە چاوەڕوانە و ئامێزی بۆ ئەو جۆرە شێعرانە کردۆتەوە جا هیوادارم ئەم بەرهەمە نوێیەی کاك ( هێرش ) بەرهەمی چاکترو پوخت‌و بە پێزتری بەدوادا بێن‌و هەمووشیان مایەی ڕەزامەندی خوای مەزن‌و و بە دڵ بوون‌و خزمەتگوزاری گەلی کوردی چەوساوە بن‌و وشەی کوردیش چیدی بەلا ڕێی ڕاست‌و چەپدا نەبرێ و لە ڕاستە شەقامەکەی ئیسلام هەتلە نەکرێ‌و بە دەستی ڕەشی ناحەزان دەسکەنە نەکرێ‌و لەسەر مێزی کوردخۆرانی بێبڕوادا بۆژۆ نەکرێ .

٣٠ / ٧ / ١٩٩١

بنارى قەندیل

ڕێبوار کوێستانی

# کەی جەژنمە [1]

وەرە بـڕوانــە لــە ڕۆژی جــەژن
شــادو دڵــخۆشــن چ پیـاون چ ژن

بە بۆنی خۆش و جلــی ڕەنگاوڕەنــگ
لە خۆشی جــەژن دەگێــڕن ئاهەنگ

پڕ دەبــن لە خەڵك شەقــامو جــادە
دەچنــە ماڵی یەك بە سواریو پیـادە

بچیــە هەر ماڵێك شیرینی و شەربەت
ئامادەیــە بۆت خـــۆشو بەلــەزەت

بــەڵام من دڵـــم ناحەســـــێتەوە
هەتــیوێــك لـــەولا بكـــروزێـتــەوە

لەبــەر ئەمو ئەو دەست پان كاتــەوە
شــەو بــە برســێتی ڕۆژ بكاتــەوە

من هەر ئەو كاتــە جەژنمـــە لێـــرە
كەس برسی نیيەو هەموو كەس تێرە !

٣ / ٦ / ١٩٨٤ ( سەنگەسەر )

---

(١) لە گۆڤاری ( ئامانج )ی ئێرانی ژمارە ( ٢٧ )دا بڵاوكراوەتەوە

# پرسەی دایکێك [1]

گیان و دڵەکەم دایکی شیرینم
سارێژکەرەوەی ئاسۆرو برینم
ئەی شادەماری سووری خوێنم
تۆی شادی بەخشی دڵەی غەمگینم

دایە گیان ئێستاش هەروا لەگەڵمای [2]
هەرچەند لە خاکدای لە ناخی دڵمای

دایە هەمیشە وام بە لاتەوە
لە تاوت دڵم خوێن دەخواتەوە
چی ئەوەندەی تۆ گەورەو بەرێزە
هەتا غەمی تۆم لەبیر باتەوە ؟

دایە بۆ هیچ شت دڵمت نەدەشکاند
وشەی بێزاریت ساتێ نەچرپاند
هەتا بوویەوە بە خەون و خەیاڵ
ڕقی پیرۆزت جارێك نەدرکاند

---

(١) لەسەر داوای هاوڕێی هاو پۆلم ( ئەختەر حەمە عەلی ) لە ڕانیە بۆ کۆچی دوایی دایکم هۆندراوەتەوە .

(٢) لە دوای هەر چوارینێك دوبارە دەبێتەوە .

دایە تۆ فێری خوێندنت کردم
بە ئامێز بۆ مەکتەبت دەبردم
شەوانەش هەتا چاوم دەچوو خەو
دڵت بە عیشقی خودا دەشردم

ئەگەر دەت دیتم کاتی بێکاریم
لەگەڵ منداڵان سەرگەرمی یاریم
سۆزێک لە دووری ڕوحت دەناڵا
دەی ڕەوانەدەوە تەمی بێزاریم

دایە کوێستانی دڵ بێ هەوارە
گەمارۆی داوم خێڵی پەژارە
سکاڵای دڵی شکاوم بەرە
دڵ بۆ مردنی لە ژین بێزارە !

دایە ئەو گۆڕە دوا نوێنە
تۆش سەرخەوێکی تێدا بشکێنە
کاروانی مەرگی ئێمەش بەڕێوە
چونکە ئەو خاکە تینووی خوێنە

٢ / ٢ / ١٩٨٥ ڕانیە

# پرسیار ؟

پرسیوته چیم ... ؟
من داستانی غەم ئامێزی ژینی گەلم
فلیمیکی ئەندێشاویم ...
قەوانی ئاسۆزی ژینم ، هەزاران جار
بۆ خەڵکی شارەکەم لێدا ...
چونکە ئاڵەی غەریبان بوو !
تاقە کەسێك گوێی پێنەدا ... !!

من نهێنی ئەو شارەمە
ئەگەر بێتو بم درکێنن ...
دەبێ هەگبەی دڵی هەموو
چەوساوەکان ،
هەڵبڕژێنن ...

من مۆمێکم ،
هەتا رێگا بۆ گەلەکەم روناك وەکەم
دەتوێمەوە ...
من چڵە گیام ، لە کوێم ببڕن
لەسەر هەمان پنجی پێشووم
دەروێمەوە ... !

٢١ / ١٢ / ١٩٨٥ سلێمانی

# بەڵێنــم داوە [1]

بــڕوادارم بــڕوادار لەســـەر پەیــڕەوی قــــورئـان
قورئانەکەم خۆش دەوێ چونکە خوێنە بۆ گیــــان
خــاوەنــی بیری نوێمــەو تازە لە خــــەو هەســتاوم
محمّد پێغــــەمبــەرمــەو هیــدایەتــی پــــێ‌داوم
شــەهیــدی مەبەســتمــەو کارنامەیــە بــۆ ژینـــم
کــە دەبــێ بیســەلمێنــم ئەوەی سەلاحەددینـــم
وەرن هەموو بەیەك دەنگ پەیمان بەستین لەگەڵ خوا
پەشــیمانە ئەو کەســـەی کە لــەم ڕێگــەدا نــەڕوا
بۆیــە تــا تونــدتــر دەبــێ ڕەهــێڵــەی لــۆمەکــاران
تــەندتــر دەیگرنــە باوەش دەوڵــەمەندو هــەژاران
تاکەی چاوی ئاواتمان لــە ئاســۆ بــێ سـێرە بــێ ؟
ئاســمانــی بەختــی ڕەشمان وەهابێ ئەستێرە بێ
دەمێکــە لــەو دیمەنــە بە سەیــری حەپەســاوم
لــە هــەوری ئائومیــدی ڕژاوە ئەشــکـــی چــاوم
بەڵام تــا گشت نەبینــە مەشخەڵێکــی بــرایـــی
ئاگاتە لوتکــەی ئامــانــج بزوتنـــەوەی خودایـــی

١٢ / ١١ / ١٩٨٦ سەنگەسەر

---

(١) وەك سەرەتایەکی جەوجۆڵی ئیسلامی بۆ یەکەم جار لــە ( دوگۆمان ) خوێندرایــەوە ، بە دەسکاریەوە .

# تەنیایی [1]

دڵ بەندی کۆت و میلە لەبەر ژینی تەنیایی
وەك کوێری نابینایە لە کونجی تاریکایی
دەسووتێت و نامرێ لە ڕووی چرای بەختی خۆی
لە پەروانە بپرسن چۆنە حاڵی شەیدایی !
هەزار جار بەرەو ڕووم دێ دێوەزمەی دزێوی شەو
خەیاڵات و ئارەزووش دەمبە نە بێئاگایی
ئاوی دەریاش لێڵ دەکا زۆری گوناهەکانم
بێ هەواڵم لە قیامەت لەبەر بەزمی سەودایی
لە دەستی خۆم دا نییە هەوێنی شیعری تازەن
خونچەو شکۆفەی گوڵان سەرنجێکی دنیایی
کز دەنوێنن وەکو یەك مۆمی شەوو بەختی ڕەش
دەتوێنەوە هەردوکیان بۆ ژیانێکی خودایی
( هێرش ) گەلێك نزیکە بەری لە غوربەتیدا
سەری زۆرانی هاڕی ئەو بەرداشی جودایی

١٩٧٨ کەوپەی

(١) لە گۆڤاری سروەی ژمارە (٤٠)دا بڵاوکراوەتەوە .

# تینووم

تینووم هەتاکو ئەو کاتەی
بە لوولەی تفەنگ و بە خوێنم
بەرنامە پیرۆزەکەی خوا
لەسەر زەوی دەچەسپێنم

تینووم تا وڵاتەکەی خۆم
بە خوێنی ناهەق خوێنینە
تینووم هەتا شەهید دەبم
لەسەر ئەو دینە شیرینە

ئەو چەکەی کردوومە شانم
ئاواتی دوا ڕۆژم پێیە
بە تاریکییەوە نانێم
دەزانم دوژمنم کێیە!

٨ / ٣ / ١٩٨٧ قەڵاتوکان

## داستانی ڕەمكان و یادی شەهیدان [١]

بەیان ئەنگوت ، وەك جاران
خۆر دای لە پۆپی داران

زەرد هەڵگەڕا دەرو دەشت
بوو بە یەك پارچە بەهەشت

چۆلەكەی بچوك و جوان
كەوتنە جریوە بۆ ژیان

هەنگ كەوتنە شیلە مژین
بۆ دروست كردنی هەنگوین

پەپوولەی سەریاڵ نەخشین
چڵاو چڵ كەوتنە فڕین

كوند لە داخی ڕۆژی ڕوون
خۆی دەكوتا تاریكی و كون

كۆتره شینكە لە قەد یاڵ
فڕی دای لە شەقەی باڵ

(١) لە یادی ئەو شەڕە تا بەرامبەرەی ڕژێم كە بە پشتیوانی سیخوڕەكانی لە سالی ( ١٩٨٧ )
بەسەر بزووتنەوەی ئیسلامی‌دا سەپاند لە قەڵاتوكان .

ئاونگ لەسەر پەلکی گوڵ
ڕژاندی فرمێسکی دڵ

لە کوردستانی بێشوان
شوێنێکی خنجیلەو جوان

بەرز وەك سەری ئیسلام
کپو بێدەنگو ئارام

لەوەش جوانتر ئەوەیە
مەڵبەندی پێشمەرگەیە

ئەو شوێنەوارە جوانە
ناوی گردی ڕەمکانە

ئەو ڕۆژە ئێمە هەموو
هەروەك ڕۆژانی پێشوو

هەریەکە لەبن دارێ
سەرمان قاڵ بوو بە کارێ

یەکێك چێشتی لێدەنا
یەك دووربینی ڕادەنا

یەکێك پاڵی دابۆوە
لە کەمین کەڕابۆوە

یەك دەچوو بۆ سەر ئاوێ
بۆ نوێژی چێشتەنگاوێ

لە ناکاودا پاسەوان
قەڵغانی سەری هەموان

کێشای چەماخی تفەنگی
شکاندی دەریای بێدەنگی

هاتن لە گشت تیرەو هۆز
وەکاریان خست پیلانتۆز [1]

لەسەر ئەو ترۆپکو زورگە
کردیان شەڕی پێشمەرگە

ئێمەش زۆر بە تەڕدەسی
لێمان دان بە بێکەسی

بە چەکی ڕیزیو بڕنەو
ڕۆژمان لێکردن بە شەو

دەنگی اللهُ اکبَر
پڕی کرد بوو دەشتودەر

لە پاش بەردو تەڕاشان
کەوتن کەلاکی جاشان

---

(١) جۆرە فرۆکەیەکی جەنگییە .

جا لە پشتەوە نەفسەر
دەنگی دان جاش و عەسکەر

بەڵام بە گوللە ، ناچار
دادەگەڕانەوە خوار

جا پێشمەرگەی پارتی زان
مامۆستا عبدالرّحمن [1]

کە دەی گرت چاوی سێرە
کێ لە ڕاستیا دەوێرا ؟

نیشانی لە کێ دەگرت
کەللەی سەری هەڵدەگرت

تا لەپڕ گیانی پاکی
چۆ خزمەت خودای تاکی

ئینجا ئەحمەد شاسوار [2]
ئارامی نەما ئەوجار

(١) شەهید لە ساڵی ( ١٩٦٥)ز لە گوندی ( لۆتەر )ی سەر بە ناوچەی ڕانیە لە دایک بووە و دەرچووی خانەی مامۆستایانە .
(٢) شەهید لە ساڵی ( ١٩٦٤ ) ز لە گوندی ( سکتان )ی سەر بە ناوچەی خۆشناوەتی لەدایک بووە ، قوتابی پۆلی دووەمی پەیمانگای پزیشکی بوو .

دەست لەسەر ماشەی[1] تفەنگ
لەگەڵ دوژمن کەوتە جەنگ

نوقاندی چاوی سێرە
دەیگوت کوشتنیان خێرە

شەڕێکی وەهای دەکرد
دوژمن لە داخان دەمرد

تا گیانی ئەویش لەپڕ
بوو بە هەڵۆی بەرزەفڕ

ئەوجار مەردی ناوسەنگەر
پیاوە چکۆڵە، کاک عومەر[2]

هەتاکو دوا هەناسەی
توندتر دەبوو حەماسەی

لە دوژمن دەچوو پێشێ
هەتا گیانیان بکێشێ

ناوی ئەویش وەک ئەوان
سووری کرد تابلۆی ژیان

---

(١) پەلاپیتکە .
(٢) شەهید لە ساڵی (١٩٦٦)ز لە گوندی ( بۆسکێن )ی سەر بە ناوچەی ڕانیە لەدایک بووە

ئینجا کەوای دی تامیر [1]
خۆی بۆ نەگیرا ، ئاخیر

تا دوا فیشەکی ناو تفەنگ
دەستی هەڵ نەگرت لە جەنگ

هەتاکو چارەنووسی
ناوی ئەویشی نووسی

چوار پێشمەرگەی قارەمان
دڵیان کەوت لە لێدان

ڕوحتان شاد مەزار ان [2] نوور
ئەی شەهیدانی ڕووسوور

بەڵام ئێوە هەر ماون
لە دڵی گەلدا ڕاون

. ١٧ / ٨ / ١٩٨٧ مالەغ

---

(١) شەهید لە سالی (١٩٧٠)ز لە گوندی ( مەمەنداوە )ی سەر بە ناوچەی ڕانیە لەدایك بووە .
(٢) گۆڕ .

# نامەی دڵ

ئەی مەل دەهەستە لە شەقەی باڵدە
بفڕە چڵاوچڵ سەرێک لە ماڵ دە

باڵندەی جوانی تیژڕەوی دڵسۆز
هەڵگرە بۆ دوور پەیامی پیرۆز

فیدات بم نالەی غەریبان بەرە
غوربەتی دڵی نەجیبان بەرە

بنیشە لەسەر دارتووەکەی ماڵمان
بپرسە لە ماڵ حاڵو ئەحواڵمان

بڕوانە باخچەی پڕ داروگوڵم
ئاوەدا یان چۆڵە وەک دڵم ؟!

ئاخۆ برادەران لە بیریان ماوم
یان ئاوارەمو لەبیرکراوم

چاوێک بگێڕە بە حەوشەو سەربان
هەر چاوەڕوانە دایکی میهرەبان ؟

سەرێک بدە لە خانەی دڵەکەم
تێر تێر هەڵمژە بۆنی گوڵەکەم

بزانە گوڵی بۆن خۆشی نازیز
ئەی ژەکاندووە خەزانی پاییز ؟!

ئەو مێوە جوانەی بەردەکی ماڵان
کە دەستی لە مل دارتوو دەناڵان

جێ سەعی کاهی شەوو ڕۆژم بوو
جێی خواپەرستی و ڕۆژوو نوێژم بوو

لێرە نەخۆشە دڵ لە تاوانی
بێنە هەواڵی مان و نەمانی

## وەڵامی باڵندە :

شاعیر وام زانی کە تۆ وشیاری
لە حاڵی ئەو دیو چاک ئاکاداری

ئەی ئەت زانیوە ڕەقیبی دڵڕەق
بە حوکمی زللەو تێهەڵدان و شەق

چی خانوو ماڵە هەمووی سووتاندوە
بزەی سەر لێوی خەڵکی تۆراندوە

بۆ هەرلا دەچی هەر قوڕ پێوانە
لە کشت ماڵێکدا پرسەو گریانە

بەکرێ دەستڕێژ مەلی بەستەزمان
پەڕاپووچکەیان گەشتۆتە ئاسمان

هێلانەو ماڵیان تێک وپێک داون
جوچکەو هێلکەیان وەبن پێ داون

هەستە ببینە هەتاکو زووە
بزانە دوژمن چی نەکردووە ؟!

١٩ / ١٠ / ١٩٨٧ هولر

# پەند بۆ پیاوی ڕەند

خێر مەکە بەکەس لەبەرچاوو ڕاو
بە ناوی ئاشتی کەس مەخەرە داو

بە کەسێك دەڵێن زانایەو ژیرە
عەقڵی سەرکاری ڕاوو تەکبیرە

ئەو کەسەی کەوا بەرز فڕیوە
بەرداشی زەمان سەری هاڕیوە

بە خەیاڵ پڵاو زێڕین مەبەرە سەر
داری خەیاڵی کەس نەهاتەبەر

دنیا وەلانێ شینی لە دوایە
مەرگێ بخوازە ژینی لە دوایە

چرای خراپە هەمیشە کزە
لە لای دزوایە هەموو کەس دزە

۳۱ / ۱۲ / ۱۹۸۷ میراوە

# خالۆی بن دیوار

دیم پیرەمێردێ پیرو پشت کۆماو
کوڕ کوڕ فرمێسکی دەهاتن لەچاو
گارەق و فرمێسک نەرم ، بە کپی
دەهاتنە خوارێ لەسەر ڕیشی سپی
ئەو دیمەنە زۆر هەستی بزواندم
گۆمی وەستاوی شیعری شەقاندم
لێی چوومە پێشێ سکاڵام درکاند
بە مەحرەمانە بە گوێم دا چرپاند
سڵاوت لێبێ خالۆی بن دیوار
ئەوە چۆنە ڕێت کەوتۆتە ناو شار؟!
لەو بن دیوارە هەڵترو شکاوی
بە شەرمەوە لەو خەڵکە ڕاماوی
دەریای خەفەتان هەڵی لووشیوی
ئەندێشەی ڕۆژگار دڵی کووشیوی
شڕو سیپانو پۆشاک دڕاوی
پشوو سوارو ماندوو خوڵاوی
چەندەت لێجوانە گەردی تەپوتۆز
چین چین نیشتووە لەسەر قژی بۆز
بڵێ بە (سائیل)[1] بۆ خەفەت باری ؟
بۆچی ئەوەندە لەژین بێزاری ؟!
گونی وەی هەزار سڵاو لەسەر تۆش
ئەی ڕێبوارەکەی بۆ خاڵ بە پەرۆش
وەرە فریشتەی غوربەت شکێنم
هەتا دەستێک بە سەرت دابێنم

(١) ئەو کەسەی پرسیار دەکات .

دەزانم ئەتۆش هاودەردی منی
پەرۆشی حاڵی ڕەنگ زەردی منی
کوڕی شیرینم ، بینایی چاوم
من برسێتی بۆ ئێرەی هێناوم
گوتم لێگەشتم ئاهی زەبوونیت
کۆشی خێزان و دەردی نەبوونیت
ئاگری لە ناخی دڵدا بەرداوی
هەر ئەوەشە بۆ شاری هێناوی
بەڵام بۆ لەوێ ئەو کارە ناکەی
داوای کۆمەکی یان پارە ناکەی ؟!
دەڵێن بەرد لە جێی خۆیدا سەنگینە
وەها یان گوتووە پیرو پێشینە
گوتی کوڕم با چاکت کەم حاڵی
وا پیشان دەدەی کە بێ هەواڵی
ئەی نەت زانیوە کە کوردەواری
ڕاگوێزراون هاتوون بۆ شاری ؟!
نە گوندێک ماوە نە سیمای دێهات
نە بەرووبوومی کە بۆ شار دەهات
من جوتیارێکی خانە سووتاوم
لەسەر ماڵی خۆم وەدەرنراوم
هەزاری پەنای هێنام بۆ ئێرە
دەڵێن خەڵکەکەی گشت ئەهلی خێرە
هاتووم مێزەرم بۆ چەند دیناری
ڕاخەم لەبن پێی سەرمایەداری
تا بیکەم بە قوتی ماڵ و منداڵم
کەمێک وەربوژێ ژیانی تاڵم
گوتم دەزانی بۆچی وەهایە ؟
ئەوەش تاوانی ئێمەی تێدایە
بەرنامەی خوامان پشت گوێ خستووە
یاسای دەستکردمان دروست کردووە

دەنا گەر ئیسلام بێتە ئاراوە
هەژارو نەدار چی لە سووال داوە
خەزێنەی دەوڵەت گشت پێویستی کار
بنەتۆو گاجوت تا نیرو هەوجار
هەرچی ئامێرە بۆت پەیدا دەکات
زەوی پشتاوت بۆ بەراو دەکات
بۆ یەکە کەوتەکان لە خەزێنەی خۆی
هەریەک بە قەد خۆی مووچە دەبڕێ بۆی
دەبی بە خاوەن زەوی و نانی خۆت
دەخۆی بەرهەمی ڕەنجی شانی خۆت
چونکە ئەوەندەی ڕەنێوی دێنی
هەمووی لی خۆتەو کەس لێت ناستێنێ
ئاستی بژێوی بەرز دەبێتەوە
بەفری هەژاری دەتوێتەوە
هەموو کەس مافی خۆی پێدەدرێ
دڵی ئاواتی هەژار بەردەگرێ
گوتی بەڵێن بێ مادام کەوابێ
سەریشم فیدای ڕێگای خودابێ
شەرتە بە پیری تفەنگ کەمە شانم
دینی خوا بکەمە بەرنامەی ژیانم
گوتم ئافەرین پێشمەرگەی وڵات
ئاواتی منیش لەوا بەدی هات
چەندە پێکەوە جوانن ، جوان
ڕیشی سپی و خەبات لە ڕێگەی یەزدان
دەک پیرۆزت بێ تفەنگ و فیشەکدان
پیرە پێشمەرگەی گەل و نیشتیمان

٢٣ / ٢ / ١٩٨٨ جەڵاتو

# دووکەڵ و بارووت

من تێکۆشەرم خاوەن بڕیارم
بێباک لە ڕەنج و ئۆف و ئازارم
بە تفەنگی دەستی ناو مەتەرێزم [1]
سنوورەکانی خوا دەپارێزم
چەند خۆشە کە بە تاریکی شەوگار
دەبڕم لوتکە چیای هەزار بە هەزار
لەسەر تاشەبەرد کپ لێی دەخەوم
دەشکێنم تاسەی ماندوویی شەوم
کە ڕێگا دەبڕم بە درێژایی شەو
یا چاوەکانم تامەزرۆن بۆ خەو
یا ئەو کاتەی کە غەرقی ئارەقم
یا ڕادەگیرێ لەسەرمان لاقم
یا لە جێ دەچێ کوڵاوەی چۆکم
یێ کەمەرە دەگرێ پەخەو بەرۆکم
یا کاتێ بەردێ لەزگ دەبەستم
یا دەم خوسێنێ دڵۆپەی ئەشکەوتم
نابن بە کۆسپی ڕێی تێکۆشانم
هەردەبڕم ڕێگای سەختی ژیانم
مادام سەرەنجام کە شەهیدییە
لە ئێش و مەینەت هیچ باکم نییە
ئەو کاتە بەرزە دەنگی حەماسەم
دووکەڵ و بارووت دەبێتە هەناسەم

قەڵاتوکان ٢٣ / ٢ / ١٩٨٨

---

(١) سەنگەر

# دەنگی جیهاد [1]

گەر وڵاتت گۆمی خوێنە دانیشتنت زیللەتــــــــــــە
گەر نەکەی شۆڕش لە ڕێی خاکا نەجاحەت زەحمەتــــــە
گەر نەسووتێ مۆمی ژینت بۆ نەجاتی قەومەکـــــــەت
کوا دەڕەخسێ ئەو ڕۆژەی کە ڕۆژی هەوڵو هیمەتـــــــە ؟
گەر نەکەی شەق شەق بە دەستی خۆت حوکمڕانی ستەم
کوا سارێژ دەبێت برینی کولاوەی ئەو میللەتـــــــــە ؟
دەستی دوعات بەس بڵندکە تۆ لە میحرابی خەتـــــا !
کەی مسوڵمانو زەلیلی خۆ سەراپات عیززەتـــــــــە ؟
ئەو کەسەی ژێردەست دەژیت مایەی کەساسی خۆیەتـــی
ئەی دەنا کوا کێ ئەوەندەی بڕوادا بە غیـــــــــرەتە ؟
چۆن دەبێ مۆمن لە ڕێی هەقدا درێغی لێبکـــــــەی
تۆلە کاتێکدا دەزانیت مردنت شەهادەتـــــــــــــە
دا هەژێنە تەوری هەقو هەڵبڕە دەنگی جیهـــــــــاد
دەی هەتا دوژمن لە خەودایە ، خێراکە دەرفەتــــــــە
ئەی وەتەن شێعرم هەیە خاکت وشەباران دەکــــــــەم
تا بزانن شێعری کوردی گەوهەری بە قیمەتـــــــــە

٧ / ٨ / ١٩٨٨ بەستەمەلە

---

(١) بە دەنگی شەهید طه بابکر لەسەر کاسێت گوتراوە

# بڕوای ڕاسته‌قینه[1]

کاتی ڕاپه‌ڕین هاتووه ده‌سا بابکه‌وینه خۆ
کرێکارو جوتیارو ڕه‌نجده‌رانی ڕه‌نجه‌ڕۆ

خه‌ڵتانی خوێنه وڵات ده‌سا په‌له بکه‌ن په‌له
ڕه‌نگی سووری گوڵه‌کان خوێنی شه‌هیدی گه‌له

ڕۆژی تێکۆشانه خۆ شه‌رمه بترسین له مردن
خاکی باب‌وباپیرمان که‌وتۆته ده‌ستی دوژمن

بازووی مه‌ردیی با هه‌ڵکه‌ین بۆ ڕزگاری وڵاتمان
بۆچی ده‌بێ بێ‌ده‌نگ بین ئه‌ما شارو دێهاتمان ؟

( ده‌ڵێن دوژمن به‌هێزه تۆپ و ته‌یاره‌ی هه‌یه )[2]
ئه‌وه‌ی شه‌ڕ ده‌کا ئه‌وڕۆ بڕوای ڕاسته‌قینه‌یه

وه‌رن به هه‌ستێکی پاك وه‌رێ خه‌ین کاروانی خوێن
بۆ تۆڵه‌ی ئه‌نفاله‌کان که که‌س نازانێ له کوێن !

ده هیمه‌تێ ڕاپه‌ڕن له گشت دێهات و شاران
با ڕه‌هێڵه‌ی گولله‌تان له دوژمن دا وه‌ك باران

جا که بتی شکاوو په‌یکه‌ر که‌وته سه‌ر عه‌رزی
ئاڵای شه‌کاوه‌ی ئیسلام ده‌چه‌قێنین له به‌رزی

٢٩ / ١٠ / ١٩٨٨ پیرانشار

---

(١) به ده‌نگی شه‌هید طه بابه‌کر له‌سه‌ر کاسێت تۆمارکراوه .

(٢) ئه‌م نیوه دێره هی بێکه‌سی شاعیره

# بۆ سەنگەرى جگەر گۆشـەم (1)

( سەنگەر ) کۆرپەلەی خنجیلە و جوانـــم
چرای ماڵ هیواو ئاواتی ژیانـــــــم
جگەرگۆشەم ، گلێنەی چـــــاوم
خۆشەویستەکەم تا لە ژین مـــــاوم
کە لەنێو ماڵدا دەهاتی و دەچـــــووی
زۆر لە پەپوولەی بەهەشتێ دەچـــووی،
هەرچەندە کەوا لێت دابـــــــڕاوم
شێوەکەی تۆ هەروا لەبەرچـــــاوم
لەگەڵ حەماسەی هەڵمەت بردنـــــــا
لەکاتی گەرمەی شەڕی دوژمنـــــــا
لەگەڵ هەر هەناسەیەك لەگەڵمـــــای
لە چاوی سێ و لە ناخی دڵمـــــای
بڵێ بەو دایکەت کەوا ڕەشپۆشـــــــە
هەرئەوە ئەرکی سەرشانی تۆشـــــــە !
لە دەرکی حەوشە بەس چاوەڕوان بێ
لەناو دوژمندا چاو بەگریـــــان بێ
کە گوللەی دوژمن دەدرێ لەســــــەرم
سەربەرزی دنیاو ڕۆژی مەحشـــــەرم

11 / 9 / 1988 کەڵەکین

---

(1) لەسەر داوای کاکە ( عبدالستار ) لە ڕانیە بۆ کۆرپە جێماوەکەی هۆنراوەتەوە .

# بەهار و مێرغوزار

دیسان هاتەوە بەهار     بەهاری دێ و گوند و شار
وڵات تێکرا بۆ گوڵزار     چرۆی دەرکرد دار و بار

لە بن ڕەنوە بەفری دۆڵ     هاتە دەرێ گیا و گوڵ
هەڵی ماڵین باسك و قۆڵ     شێرەژنی منداڵ لە کۆڵ

لەو شاخ و دۆڵ و شیوە     بۆتە بەزم و قریوە
ژن و پیاو خزیوە     دەچن بۆ گیا بڕژیوە

گاوانی پشت بە تێشە[1]     گاڕانی دێی لە پێشە
کەوتونە گورگە مێشە[2]     بۆ بن سێبەری مێشە[3]

کەو لە بەرزی دەخوێنن     چۆلەکە دەجریوێنن
کۆتری شاخ دەگمێنن     بزن و مەڕ دەباڕێنن

مەنگی جوان و خنجیلە     لە گوڵ هەڵدەمژێ شیلە
لەسەر کڵوکە حاجیلە     دەخوێنێ حەوت ڕەنگیلە

شوان بە ناڵەی شمشاڵ     کە وە پشت کەوت لەماڵ
هەر فوی پێدا کرد بە حاڵ     دێنە دەرێ کەوڕ و کاڵ

---

(١) تونێشوو ، هەگبە ، کۆڵ .
(٢) ڕەشەوڵاخ لە گەرمای هاویندا مێشێك دێت پێوەی دەدات کە ( مو شی پێدەڵێن و کلکی هەڵدەگرێ و خۆی بۆ بن سێبەرێك دەکوتێت ، دەڵێن گورگە مێشە .
(٣) باخچە ، بیشەڵێن .

کاریلە و بەرخی نێوەـــــــڕ
لووت دەگێڕن بۆ لـــــــەوەڕ

لە نێو بارزە و شەشـــــــپەڕ
دەخۆن گیای شـــــــلك و تەڕ

قاز و مراوی خۆ دەشـــــــۆن
مێروە باڵـــــــداره دەڕۆن

بەبادەدەن خەمـــــــی کۆن
( کەندە سمە )[1] دەیان خـــــۆن

( پێوورچە ، مێخەك ، شـــــەوبۆ )
کە دەبن مەلۆ مەلـــــــۆ

( ەموســــــــن و گوڵەفرۆ )
بۆنیان دێ بـــــــۆ من و تۆ

( وەنەوشە و کەما وکنێـــــــر )
لە لوتکەی شاخ و هەڵدێـــــــر

( مەندێ و ڕەزیانە و شـــــلێر )
وڵاتیان کردە زەنوێـــــــر

( هەڵز ، کاشمە ، کەزگەسکـــــە )
( سەپان تڕنە ، گوڵەگورگـــــە )

( مێکوك و بوژ ، توڕاســـــکە )
( گیاچا ، زەنبەق ، تیسموزگە )

( هوزەلاو ، بەنگ ، ڕەکێشـــــە )
( کەر تەشی ، دوو قلیشـــــە )

( گیا سەدر ، خۆش هەڵکێشە )
دایان کوتاوە ڕیشـــــــــە

( شەمێلە ، ماکۆز ، سپێنـــــاخ )
( چەقچەقی ، هێرۆ ، قەیـــــاخ )

( ترشە خاتوون ، گوڵەبـــــاخ )
( بێستانە مارە ، قاشـــــاخ )

( ئەسپۆن ، مۆسك ، گوێکـــار )
( سەعلاب ) یان ( گوڵە جوتیار )

( سۆشـــین ، ئاوڕێژ ، گەنەدار )
خەملاندوویانـــــــە بنار

---

(١) مێش خۆرە

قورینگان ، پێچۆلەکە )　　( گیا پشیلەو پێچووکە )
( شوەشینە ، بۆن خۆشکە )　　( کەرتەوڵ ، کەلوەلووسکە )

( مژمژۆکە ، قنجەزەرد )　　( قازیاخە ، نێرگز ، مێژوەرد )
شین ومۆر و سپی و زەرد　　نەخشا شیوو دۆڵ و هەرد

( بێژان و پوور ئایشۆکە )　　( گوڵە نەورۆز ، ترشۆکە )
( ڕەبناوك و کەپرۆکە )　　( حەندرێشە و سیرمۆکە )

( شیلان و پنگ و بەیبوون )　　( مەندیلان و گوڵەپوون )
( گوێزبەلە ، کەلوەخاتوون )　　ئاودێری ئاوی ڕەنوون

( ورمزە ، تۆق تۆقیلە )　　( تۆڵەکە ، بووك دەرزیلە )
( هەڵاڵە و گیا ماميلە )　　( خەرتەلە و پێقنجیلە )

( کەلوەمارە و خاتوونە )　　( ئانەکەوە و کوڵکنە )
مەندۆك و گیاگون گونە )　　خواردنی پیاوو ژنە

یاخوا بەخێربێ بەهار　　بۆ دێهات و گوندو شار
بۆ سەپان و کرێکار　　بۆ خوێندەوارو جوتیار

١٧ / ١٠ / ١٩٨٨ پیرانشار

# کوڕو باب[1]

ئەتاکەی باوکی شیرینم چاوت وا هەر لە ڕێگابێ
لەگەڵ تاریکی شەوگارا کوڕی تۆ بەڵکە پەیدابێ
ئەتاکەی چوونە سەر ڕێگای کاروانی ئاشنایانت
کە نامەیەك یان هەواڵێکی کوڕی تۆی بۆت هێنابێ
لەگەڵ ڕازی تەقەی تفەنگا دەبێ دەنگم بەتۆ بگات
بە وشەیەك کە ڕاستەوخۆ بە ڕوحی تۆ ئاشنا بێ
خۆشترین شوێنی منداڵیم پشتە چەماوەکەی تۆ بوو
فێری بەرزیت کردم بۆیە دەبێ جێم لووتکەو چیا بێ
هەڵمەوەرێنە فرمێسك بۆ کوڕی بەرزەفڕی خۆت
گریانی بۆچییە کەسێك خۆی بۆ شەهیدی دانابێ
بابە هەموو ئەوانەی کە لە کەژوکێوان دەکوژرێن
هەموو باب وکوڕن ئەدی بۆ دەبێ دڵی تۆ وابێ
دەزانم بە کوێرەوەری پێت گەیاندوومە بابەگیان
پەشیمان مەبە لەو ڕەنجەت مادام لە پێناو خوادابێ
لە پشتی چەماوە جوانە فیشەك دانی کوردەواری
کە بەڵکو دوژمنی دڵ ڕەق یەکجاری کوێرایی دابێ
حەماسە خولقێنە ڕیشی بۆز لەناو کۆڕی خەبات
کە بەڵکو بەو عیشقە پاکە ڕەقیبمان وێڵ و ڕیسوا بێ

( ١٩٨٨ ) شێخ ئایش

---

(١) نامەیەکە لەسەر زمانی پێشمەرگە ( خدر نەبی جەلك ) بۆ باوکی بەجێماوی .

# چەوساوەکان واهاتین

چەوساوەکان واهاتین   دوور خراوەکان واهاتین
ئێمە مژدەی ئازادین   هێمای یەکسانی ودادین
بێ ناوەکان وا هاتین

هەر ئێوەن ئازار دەدرێن   ئێوەن ئاوارە دەکرێن
ئێوەن کە بێنوێنن   شەڵاڵی گۆمی خوێنن
جێ ماوەکان واهاتین

مۆمی ڕێی کوردایەتین   مەشخەڵی برایەتین
ئێوەن کەنادەن وچان   بۆ کامەرانی هەموان
دەرکراوەکان واهاتین

دوژمن سیفەت هیتلەرە   دژی هەموو بەشەرە
کوردستان لێڵی تەمە   ( هیروشیما )ی دووەمە
داماوەکان واهاتین

کوان هەق ویستەکان لە کوێن   بۆ دیتنی ئێوە بێن ؟
سەیرکەن ماڵو حاڵتان   ببینن ژینی تاڵتان ؟
کۆماوەکان واهاتین

خۆ هەرنەبێ ئینسانن   عەودالی خۆشیی ژیانن
تاکەی جەوری [1] ستەم کار   لە ئێوەی چینی هەژار
ماف خوراوەکان واهاتین

٢ / ١١ / ١٩٨٨ سنە

---

(١) ستەم ، زوڵم

# مەشقی سەربازی [1]

ئەی موحەممەد لاوەکانت ڕا پەڕیـــــــن
بوونە یەك بورکانی تۆڵەی ئاگریـــــن
قوتابیانی قوتابخانەت پێگەییـــــن
چونکە لە فێڵی دوژمنان تێگەییـــــن

بۆ ئازادی بۆ ڕێگای سەرفیـــــرازی [2]
کەوتونە ڕێ بەرەو مەشقی سەربـازی

ئەی موحەممەد شاخەکانی کوردســــتان
بوونە مەکۆی مجاهیدی چەك لەشـــــان
تا بدەن بەرپەرچی فێڵی دوژمـــــنان
وا دەڕۆن بەرەو مەشق و خۆڕاهێنـــــان

ئەی موحەممەد سەیری لاوەکانت کــــە
تەماشای شوێن کەوتوانی قورئانت کــــە
سەنگەرەکانت نوێ دەکەنــــــــەوە
پەرە بەدینی ئیسلام دەدەنــــــەوە

---

(١) بەبۆنەی کردنەوەی یەکەم خولی مەشقی سەربازی لە گەیلانغەرب .
(٢) ئەم دوو نیوە دێرە لە دوای هەردوو دێرە شیعرێك دوبارە دەبێتەوە

مزگێنی بۆ سەلاحەددین هاتـــــەوە
دەنگی قورئان کەوتە ناو وڵاتــــەوە
گەشــاوە بازاڕی ڕەونەقداری دیـــــن
تا بنەخشێ مێژووی چارەنووسی ژیــــن

کوردە کاتی مەشق و تێکۆشانتــــــە
ســوپەرو قەڵغانی شـەڕ ، ئیمانتـــــە
دوژمنت پیلانێکی بەدەستـــــــەوە
لێی ڕاپەڕە گەر گلاشی ئەستــــەوە

(٩/ ١٢ / ١٩٨٨ ) کەبلانفەرب

# پەیامی شەهید

ئەی شەهیدی خوێناوی تۆ ئاواتی کەڵانی
تۆ مایەی سەرفیرازی تۆ نۆخژنی دڵانی

تۆ پەیامێکت پڕیە هاواری نێرو مێیە
پەڕاکەندەی نازانن کە نیشتیمانیان کوێیە

تۆ کاروانی تیژڕەوی پەیامی خوێنن پڕیە
ڕازو نیازی هەزاران بێسەرو شوێنت پێیە

تۆ بڵێسەی ئازادی مەشخەڵی [illegible]ەڕینی
هەڵۆی کوێستانە کانی فێری بەرزە فڕینی

کوشتەی دەستی هۆلاکۆ و هیتلەرانی سەردەمی
ستەم دیدەی ناکازاکی و هیرۆشیمای دووەمی

بیروباوەڕ ، تێکۆشان ، حەماسەتی ئاکرین
فێری تۆیان کردووە مانای وشەی نەبەزین

کاتێ مێشکت دەپژێ ڕووسووری لای یەزادانی
لە ڕۆژی مەحشەریشدا لەگەڵ پێغەمبەرانی

١٢ / ٢ / ١٩٨٩ پیرانشار

# چیتان نەکرد ؟

چیتان نەکرد بە کوردستان بە زێدی ڕەنگینی کـورد ؟
چیتان نەکرد بە وڵاتو مەسکەنی دێرینی کـــــورد ؟
ئێوە لافاوی خوێن بوون بزەی لێوانتان ســـــــڕی
بوونە باعیس داڕژانی جۆگەلەی ئەسرینی کــــورد
دەم کوژێتو نایەڵێ دەنگم بە عالەما بگـــــــات
تا نەزانێ کەس کە چۆنە حاڵو باڵو ژینی کــــورد
ئاگرو ئاسن دەبارێنێ بەسەر خەڵکی هــــــەژار
چونکە زەندەقی چووە دوژمن لە ڕاپەڕینی کــــورد
خۆ ڕەقیبی دڵڕەقی کورد دوژمنی کورد نیە بەتەنـێ
هەڵدەکەنێ هەڵزو بیزای کوێستانی نەخشینی کورد
زۆر نەماوە بێتە بورکان هەستی تۆڵەو ڕقی خەڵــــک
بێتەدی ئاهو نزاو پاڕانەوە و ئامینی کــــــــورد
تێکی داوە گشت نەریتو دابی کوردەواری کـــۆن
ناچنەوە سەر بانەمەڕان ئایش و فات و هەمینی کورد
خۆ ژیان مۆڵەتم نادا بنووسم ژانی قەومەکـــــــەم
خۆ دە ئاشێعرم دەبوونە مەشخەڵی زێڕینی کـــورد

مهاباد ١٩٨٩ / ١ / ٢٧

# شێعرەکانم

شێعرەکانم هەستی پاکن هەڵقوڵاون
ژیلەمۆی ئاگردانی گوندی سووتاون
ڕێبوارێکن بەرەو ئاسۆ ڕێ دەپێون
ڕازو نیازی هەژارێکی لێقەوماون

شێعرەکانم ژانی پشتی چەوساوانن
پەیامی میللەتێکی زۆر بێتاوانن
سۆمای چاوی پاسەوانی لەسەر هەستن
خوێنی دڵو فرمێسکی سوێری چاوانن

شێعرەکانم پاڕانەوەی دوای نوێژن
بۆ داهاتوو چاوی سەرکەوتن دەڕێژن
پارچە کفنن ل[illegible]مەیت ئاڵێنراون
لێژنە لاشەی دوژمنانی گەل دەنێژن

شێعرەکانم زایەڵەی دەنگی کاروانن
نووزەی کوردو نرکەی جیهادی ئەفغانن
شیری دەستی عومەری کوڕی خەتابن
خوێنی ئاڵی شەهیدانی ڕێی قورئانن

شێعرەکانم هەستی غوربەت دەڕەوێنن
مژدەی بزە بە دیاری بۆ منداڵ دێنن
دەبنە بەستەی لایەلایە هەتا بەیان
لانکی هەتیوێکی بێباب ڕادەژێنن

١٢ / ٢ / ١٩٨٩ پیرانشار

# تەرمی ڕۆڵەکەت هاتەوە (١)

تەرمی ڕۆڵەت هاتەوە دایە وەرە پێشوازی
خەڵتانی خوێنە لاشەم لە ڕێگای سەرفیرازی
شانازییە دیاریم ، لاشەی سوور کفنی ئاڵم
هێماو مایەی سەربەرزیم توخوا مەگری بۆ حاڵم
لەپاش شەهیدبوونی من ون مەکەن ڕێبازەکەم
تا دەبینن ئازادی کەلە بێنەوازەکەم
لە پێناوی ئامانجم من خوێنی خۆم ڕشت دایە
شینم ناوێ شەهیدم ڕێگای شەهیدان وایە
خەندە لێوت بەرنەدا نەڕژێ ئەسرینی چاوت
با شاد نەبن دوژمنان بەفرمێسکی ڕژاوت
نەفامییە ڕەش پۆشی کە بنوێنی بە بەرگت
مژدەی ئازاد پێیە تەرمی جوانە مەرگت
دەزانم دایە سۆزت بێپادە و بێسنوورە
جەرگت دەبرژێت بۆمن دڵت وەکو تەنوورە
شەهیدم مەگریە بۆم لەسەر لاشەی خوێنینم
تەماشاکە ڕەنگینە ئاسۆی بەهاری ژینم
بزەت بێتە سەر لێوان ئەی دایکی میهرەبانم
لە دوای من دڵت خۆش کە بە خواو هاوسەنکەرانم
ب

٥ / ٤ / ١٩٨٩ گردشەیتان

---

(١) کاک حسن عثمان بۆ یەکەم جار ئاوازی بۆ داناوەو لەسەر کاسێت تۆماری کردووە .

# چارەنووسی بوون

هەرچەندە کەوا منداڵیـــــــن
بە یاسای خـــــواوە عەوداڵین
وەکو باوکمان تێکۆشـەریـــــن
هاوڕێی ئەشکەوت و سـەنگەرین
چەک و قورئان والە دەستمـــــان
دەبڕین ڕێی سەختی مەبەستمان
مەشخەڵـی بەرزی ئازادیـــــن
خوێنی سـووری ڕێی جیهادیـــن
دەڕۆین بەرەو ئاسـۆی ڕوونمـــان
بەرەو چارەنووسی بوونمـــان
ئاگاداری دەور وبەریـــــــن
لە کرداری خراپ بەریـــــــن
هەرچەندە کەلێـرە نامۆیـــــن
فریوی دەسـتی کەس ناخۆیـــن
( هیجرەت )[1] ئەمرێکی خواییـــە
بۆیە لامان ئاسـاییـــــــــە

دیلـــــزێ ١٩٨٩

---

(١) کۆچ کردن لە ڕێگەی خوادا .

# کارەساتی پشدەرێ [1]

چریکەت وەتەن دێتە گوێ مـــــەوە
ئێوە دەڕۆن تا ئەمن دێمـــــەوە
هاوارتان ناگات بە گوێی دنیـــــاوە
چونکە دەمێکە کورد لێی قەومـــــاوە
ئاسۆری باوکی پشت کۆمارەیـــــە
سەدان ئاواتی دامرکاوەیـــــە
دیسان لێی ئاوە کۆچی ناچـــــاری
بۆ چارەنووسی ون و نادیـــــاری

لە کێ بپرسم هەواڵی ئێـــــوە ؟
هەرچی دەیبینم ڕەنگی پەشێـــــوە
شێعر و خەو هەردوو یاخین نازانـــــم
ئەو لە قافیەو ئەم لە چاوانـــــم
ئەرێ شاخەکان گەلم بۆ کوێ چـــــوون ؟
خۆ ئێوە بەرزن لەنگۆشڕا[2] ون بـــــوون ؟
لە دووریتان خۆ سوێشم بێتـــــەوە
پیاو بێ ئازادی شەرمە بێتـــــەوە

---

(١) لە یادی گواستنەوەی بناری قەندیلدا بەدەستی ڕژێم .

(٢) لە ئێوەشڕا .

ئەرێ ھەتاکەی وا ئاوارە بیـــــــــــن ؟
لە خاکی خۆمان بۆ غەوارە بیـــــــــــن[1] ؟!
تاکەی فرمێسکی چاوان بڕێژیـــــــــــن ؟
لاشەی ئازیزو لاوان بنێژیـــــــــــن ؟!
بەڵام ئەوەی کە هۆی سەرکەوتنـــــــــــە
تاکە دروشم و قەت نەسرەوتنـــــــــــە

دیسان بۆ کارەساتی پشـــــــــــدەرێ
با دوو دڵۆپە فرمێسک هەڵـــــــــــوەرێ
سەری هەڵداوە غەم و کەیســـــــــــەری
بەهاری هیوای سەوزم هەڵـــــــــــوەری
وادیسان کوردی ئازاو قەڵەنـــــــــــدەر
لێی گیران چوارلاو پشت و دەوروبـــــــــــەر
دەیان پەککەوتەو ئافرەتی دامـــــــــــاو
لاشەی کەوتە بن کەلاوەی ڕوخـــــــــــاو
لەگەڵ شریخەی تفەنگی دوژمـــــــــــن
بەرز دەبۆوە زیڕەو گریـــــــــــەی ژن
ناتوانم بێمە کوڕی ماتەمیـــــــــــن
لێرە دەگێڕم بۆتان گەرمەشیـــــــــــن

(١) بێگانە .

( کۆشکەڵە)و (سەید ئەحمەدان ) ، (چۆم خڕکە )

(گریداخ )و ( سوڵتانە دێ )و ( خەندەکـــــــە )

( کەوێ بابەسەنی )و ( قرژاڵە بـــــــــڕێ )

( سندۆڵان )و ( بارەپانە )و ( کەنجـــــــاڕێ )

یان ( کێلە سپی ) هەوارگەی بەفـــــــــر

بوون بە مۆڵگەی تەراتێنی[1] شـــــــــەر

بەڵام داخەکەم غەیری هەڵپەڕیـــــــــن

نەجوولا لێیان هەستی ڕاپەڕیـــــــــن

کوردە تۆ ئەوەی سەلاحەددینـــــــــی

دە پەلاماری بۆ ڕادەمێنـــــــــی ؟

لە بێئاگایی و ختیەتی هەستـــــــــی

خۆت بسەلمێنە تاکەی ژێردەستـــــــــی

قارەمانانی وڵاتت نەدیـــــــــن

تا لێیان فێربی دەرسی ڕاپەڕیـــــــــن ؟

کزۆڵەی بۆیە دوژمن بوو خەنـــــــــی

تۆ دەگرێیی وئەو پێدەکەنـــــــــی

( قەڵادزێ ) بووکی ژێر تارای غەمـــــــــم

هێرۆشیماکەی چەرخ و سەردەمـــــــــم

---

(١) ڕەمبازێن

ئێستاکەش خوێنی ساڵی حەفتاوچـــــوار[1]
لە کزنەزامی خەڵك دێتە خـــــــــوار
داخەکەم شاری ( زانکۆ ) وقوربانـــــــــی
هەتا چۆك نەکرای ڕێزیان نەزانـــــــــی

هەواری خێڵی دڵ بوو ( قـــــــــادراوا )
بەهەشتی خوابوو بەسەر دنیـــــــــاوە
ئێواران دەچووی بۆ ناوباخی سێـــــــــو
وێکڕا دەجووڵان زمانو زارو لێـــــــــو
هێشووی جوانی ترێ هاتبوونەخـــــوار
دەت گوت دوژمنە دراوە لـــــــــە دار
سەرچاوەی ئاوی بەفری کوێســــــتان بوو
دەوروبەری گشت باخی جـــــــوان بوو
بەژێر باخاندا دەڕۆیی ڕووبـــــــــار
جنّات تجری من تحتها الانهـــــــار
لە دوورڕا دەت گوت شاری گوڵانـــــــە
گوڵیش نیعمەتی جوانی یەزدانــــــــە
نێرومێ گوڵیان دەدا لە یەخـــــــەی
بەسەد ئاواتو ئومێدو ئۆخـــــــەی
سۆزی گوڵ بۆ گوڵ دەپشکوێ لـــــەوێ
لات سەیر نەبێ گوڵ گوڵی بـــــوێ !

(1) لە ساڵی ( ١٩٧٤ ) ز دا قوتابیانی زانکۆی صلاح الدین بە هۆی شەڕی ناوخۆوە پەرتەوازە بووبوون لە قەڵادزەدا جێگیر بووبوونەوە ڕژێم بەفڕۆکە بۆمبارانی کردن .

بەڵام سەد حەیف کە قـــــــــــــدراوا
ئێستاوەك ئاشی ئاولێبـــــــــــــڕاوە
کۆڵانەکانی لە خەڵك چۆڵـــــــــــــن
بچیەرێ تەپۆ چاوت دەکوڵـــــــــــــن
ئەوەندەی کە لە سنووری چـــــــــــاوە
تارمایی‌خانووو ماڵی ســــــــــووتاوە
هەنارو هەرمێ‌و هەڵووچە وەنجیـــــــــر
بۆ مێش و دەعبا بوونەتە نێچیـــــــــر
سۆزی نەجوڵا دوژمن لە ڕاســـــــــی
سەگی بەرەڵاو پشیلەی برســـــــــی

کوانێ توورینگان بە ناوی (سیفـــــــــوّن)
شاپەڕو باڵو گەردنیان بشــــــــــوّن ؟
کوانێ قریوەو بەزمی ڕەوەنــــــــــدان
مێگەل بێننە سەر جۆگەی (شــــــــەهیدان)
کوا نێنە چاوان پڕ پڕکەن لە کـــــــــل
تەدیقە شۆڕو چارۆکە لە مـــــــــل
چۆن ناسۆر نێنێ کۆنەبرینــــــــــم ؟
بە ئێوەم خۆش بوو مانەوەو ژینـــــــم

شارەکەی بووکی شاران ( سەنگەســـــەر )
بەرگی بێزاری و غەمی کردەبـــــــــەر
چەند دڵڕفێن بوو ( سیفۆن )ی جوانـــــــی
هاژەی (گاڕفێن ) و بەفری کوێستانـــــــی
خاوەنی فێرگەی (میرزا ڕۆستەم ) بـــــــوو
لە سنووری خۆی نموونەیکەم بـــــــوو
زۆر خوێندەواری بەرزی پێگەیانـــــــــد
( اطلبوا العلم )ی چاك بەجێگەیانـــــــد
هەتا وێران کرا ئەویش سەرەنجـــــــام
دژی فێربوونە دوژمنی نەفـــــــــام

لێرەش لە بیری ( عەوڵای مەلا )[1] مــــــــە
دەبێ هەر مابی ئەوتەختەدامـــــــــــە
کە بەچڵکی دەست چەور بـــــوو وەك ڕۆن
ڕەواجی زۆر بوو وەك ئاسـ[illegible]ی کـــــۆن
جیرانەکانی گشت بانگ دەکــــــــردن
غەمی ڕۆژگاری لەبیر دەبــــــــــردن
هۆشی نەدەماڵە لای دوکانـــــــــــی
تووڕە دەبووی لێی موشتەریەکانــــــی
هەرچەند لە فێڵی دامە زۆر فێـــــــرە
بە ( حاجی ئاڵی )[2] قەت نەدەوێـــــــرا
چونکە لە دامە زور خۆی دەبـــــــوارد
بە کرمانج ئاغای ئەوی دەخــــــوارد !

---

(١) ( عبدالله ملا عباس ) دوکاندارێکی شاری سەنگەسەر بوو. زۆر ئارەزووی لە دامەکردن بوو لە هەموو لایەکەوە دەهاتن تا ئێوارە دامەیان لەگەڵدا دەکردو قەت لە دامە بێتاقەت نەدەبوو.

(٢) حاجی ( احمد ئاڵی ) ، پیرەمێردێکی تر بوو ئەویش سەری دەخورا بۆ دامەو دوکانەکەی خۆی بەجێدەهێشت و دەهات لەگەڵ (عەوڵای مەلا ) دامەی دەکرد ، بەڵام لە هونەری دامەدا لێزان بوو .

ئەی ( حەمە سەعید )[1] چلۆن بێ حاڵـــــــــی
پاری خۆشتر بێ یانە ئەو ساڵــــــــــی
ئەو لەو دنیایە گەر سەری قاڵـــــــــــە
لەوێش دەفرۆشێت هەر وردەواڵـــــــــە ؟!
دوکانەکەی کە هیوای منداڵ بـــــــــوو
منداڵیش بێوی ژیانی تاڵ بـــــــــوو
کاتی قوتابیم وەی یادی بەخێـــــــــر
زگی برسیم زۆر لەوێ کردووە تێـــــــــر
یادەکانت قەت ناکەم فەرامـــــــــۆش
پیرەمێردەکەی ڕەزا سووک و خـــــــــۆش

نە ( داک حەبیب ) و نە ( چۆمە ســـــــووتاو )
لێی نابینی کەس تا دیارە لە چـــــــاو
لە( ئاشوران )ڕا تا ( دوازدە بانـــــــــوو )
یەکسانی خاکن تارمایی خانـــــــــوو
مێلاقەکانی بناری ( کێـــــــــوەڕەش )
غەمیانە سەریان گرتووە لە هـــــــــەش
( سەر بە کڵاوە )و مەلی بەندەنـــــــــێ
ئاواز دەخوێنن بە تاقی‌تەنـــــــــێ
نەدێتە بەرگوێت هۆوەرەی جوتێـــــــــر
نە هۆیە ڕەشماڵ دیارن لە زەنوێـــــــــر

---

(١) پیرەمێردێکی ڕەزا سووک بوو، دوکانەکەی پڕ بوو لە وردەواڵە ، هەمیشە دوکانەکەی لەبەردەرکی قوتابخانەدا بوو منداڵ ڕۆژانەکەی‌خۆیان لە دەستی ئەو دەکرد .

کوانێ (مام خدر ) شمشاڵ دەژەنێــــــــن
هەوای ( حێل وەرە )[1] بۆ خێڵ بخوێنێــــــن ؟
کوانێ براگەورەو ڕیش سپی مـــــــاوە
بڵێ خۆ بەفری قەندیل تــــــــــواوە
لە دەشتێ تێری خواردووە مـــــــاڵات
سازین وا جەنگەی خێڵ بەرەو ژوورهـــــات
لە ( گردی حوسنی ) تا (دارەزیـــــــو)ێ
پیاوێك نەماوە سەری ببزێـــــــوێ

( پیران )و ( چەلکان )، ( زەنگلان )و ( مەمکان )
( ڕەسووحاجیان )و بەرزایی ( دوپـــــان )
( مەندەمەران ) و ( زوورکان )ی سەرکـــەش
کە( زێڕنەکێو )یان گرتۆتە بـــــاوەش
ئێستاکە هەمووی خاپوور کـــــــراوە
تابلۆی مەرگی لەسەر چەقـــــــاوە
هاژەی ڕووباری ئاوی ( ســـــــوورەدێ )
خوڕخوڕ دێتـە خوار بەرەو ( بـــــڕەدێ )
( سینەمژکە )ی جوان بەقەد چیـــــاوە
دەستی لە ملی قەندیل ئـــــــاڵاوە
ئێستا وەك شاری مەرگ خامۆشـــــــن
بۆ گەڕانەوە زۆر بە پەرۆشـــــــن
کچی ( پرد مەمکە ) و پەری ( کاســـــکان )
بۆ مەڕ دۆشینێ هەڵ ناکەن باســـــکان

---

(١) ئاوازێکی شمشاڵە .

( ئاشقوڵکە )ی بەرزو گوندی ( سەرگەی نێــڵ )
چاویان بڕیبۆ هەوارگەی ( پەڕسوێـــــــــڵ )
کۆمەڵە ماڵێ ناوی ( بەرد کـــــــــوڕان )
لێ‌ی ئاین ئەو ساڵ حەماسەی کـــــــوڕان

چەند دڵڕفێن بوو گوندی ( قڕناقـــــــــەو )
هەڵی‌دەستاندی چریکەو دەنگی کـــــــەو
دیمەنی جوانی هەردوو ( پشتاشــــــــان )
( ئێندزە )و ( بۆڵە ) تا ( ئەستێڕۆکـــــــان )
( نێودەشت )و تەواو دۆڵی ( شارۆشــــــــی )
دەستە ملانن بۆ سەرەخۆشـــــــــــی

کوا خۆ تێ‌پەڕی خێڵ بێن بـــــــــەرەو ژوور ؟
ڕەشماڵیان هەڵدەن سنووراو سنـــــــــوور
بەهاری سەوزم هەرچەنـــــــــــدە زووە
ڕەنگی پاییزی لەخۆ گرتـــــــــــــووە
مێلاقە خوێنی خاکی مشتـــــــــــووە[1]
بە کلدانی غەم چاوی ڕشتـــــــــــووە
کانی‌و سەرچاوە چاودێری خێڵـــــــــــن
دەڵێن بۆ نایەن بەجێمان دێڵـــــــــــن ؟

---

(١) مژیوە .

شنەبای شەماڵ گیا دەمەژێنـــــــــن
مەلالە نوستووە گوڵ ڕای دەژێنـــــــــن
( بۆر )ێ کوێستانان چین چین نیشتـــــــووە
( گەنەمە )ی قەدپاڵ لەداس کەوتــــــــووە [1]
بۆتە زەمەندو چـــــــــــڕژاوە وڵات
مەڕو مێگەلێ نەمارە بیخـــــــــــوات
( گوڵەڕوون ) بۆنی عەتری دەڕژێنـــــــن
کەسێك نیە بێو سەری بپسێنـــــــــن

نە شوان ماون نە شەنگەبێـــــــــــری
چۆڵن ( کۆترەڵ )[2] و ( خوار )[3] و ( گەڵنێـری )[4]
ساڵی پار بایە ئێستاکە دۆستـــــــــان
بە ئارەزووی دڵ دەهاتنە کوێستـــــــان
لێیان دەنا تاوڵ ، چیخ و کۆچ و بـــــــار
هەرکەس دەچۆوە سەرکۆنە هـــــــەوار
یا دەهاتن بۆ بستووی ( شێخ شـــــەرۆ )
تا زیاتر بگرن ڕۆنە کـــــــــەرەو دۆ

(١) ڕەق بووەو دەپەڕێت .
(٢) (٣) (٤) سێ هاوینەهەواری کوێستانی مەنگوڕانن .

کچی کورد کاتێ دەچۆ دار هێنـــان
دەری دەهێنان ئاوێنەو کلـــدان
تا دەهاتەوە چاوی دەڕشتـــن
دوژمنی خاکی بەچاوردەکوشتـــن
بۆتەشی ڕستن دەچۆ پشت مـــالان
دڵی گەنجانی لەخۆ دەئـــالان
ژنی کورد ماندوو نابێ لە کـــارێ
گەر بە ئازادی بێتە هـــەوارێ

بە ئەنقەست شوان چۆن خۆ دەبوێـــرێ
ئەگەر لە ترسی دوژمن بوێـــرێ !
شەو هاوڕاز بووبێ لەگەڵ قەندیلـــی
ئەستەمە هەڵکات بە ژینی دیلـــی
ئەو لەگەڵ پۆڕان چۆتە بەندەنـــێ
کوانێ هەڵدەکات لەوێ بەتەنـــێ
لەکام جێ بەرزە نەمژێ هەوای پـــاك
لەئەوشێ[1] دا مەڕ نەکا زاوومـــاك [2]
شەوانە نەگرێ بەنی دەست بێنـــێ[3]
مەڕی ڕانەدا شەو بۆ شەوێنـــێ [4]
بە نالەی شمشاڵ ژیان نەدوێنـــێ
بە قەولی شوان عەمری نەمێنـــێ

---

(١) ئەو جێگایەی مەڕی لێ ڕادەگرن .

(٢)مەرتن بەردان .

(٣) شوان پەتێك لە ملی مەڕێکی وریا دەئاڵێنێ و سەرەکەی تری لە باسکی گرێ‌دەدا لە کاتی هێرش بردنی گورگدا ئاگای بێتەوە .

(٤) ڕادان و لەوەڕاندنی مەڕ لە شەودا .

( هێرش ) وریابە خەڵك ناچـــــــارە
بێئومێد مەبە گەلت وشـــــــیارە
ڕۆژێك ڕاپەڕین بەرپا دەکـــــــرێ
خاکی کوردستان ئاوا دەکــــــرێ
ها لە پیاواندا جووڵا غیرەتـــــــێ
گەورەو بچوکم کردیان هیممەتـــــێ
بەیداخی تاغوت دەکەن سەرەوژێـــــر
دەگەڕێتەوە سودو خێرو بێــــــــر
گەلت کە ئەوڕۆ خۆی مات کـــــردووە
شۆڕشی نوێی دەدڵ گرتـــــــووە
ئەگەر فرمێسکی چاویش دەڕێـــــژن
قوڕ دەگرنەوە و دوژمن دەنێـــــژن

٦ / ٧ / ١٩٨٩ کوێـــزێ

# منداڵی شاخ

بابە بۆچی ئاوارەم     بۆ غەریبی ئەو شارەم ؟!
بۆ دوور لە نیشتمانم     بابە چییە تاوانم ؟!
بۆچی ڕووت و بێبەرگم     لەبەر چی زەردە ڕەنگم ؟!
بۆ منداڵی ئەو شارە     کامەران و بەختیارە ؟!
هەموو پۆشتەو پەرداخن     کەی وەك منداڵی شاخن ؟!
بابە بۆچی ئاوارەم     چییە تاوان لەو کارەم ؟!
ئەدی کوانێ وڵاتم     کوانێ شارو دێهاتم ؟!
بۆ کوێ چوون پۆلی دۆستان     کوان لە کوێن خێلی دۆستان ؟!
کوانێ خوشکە ( ڕوناك )م     لە کوێیە قەبری داکم ؟!
بۆ هەر چاوەڕوان دەکەم     نەهاتەوە برایەکەم ؟!
بابە بۆچی ئاوارەم     نوقمی غەم و پەژارەم ؟!

( ١٩٩٠ ) دیلزە

# کێ ژن بە بەختیار دەدا ؟

لە شوێنێکی کوردستان     مەڵبەندێکی خۆش و جوان
هەڵکەوتوو بناری شاخ     بە هەرچوار دەوریدا باخ
خەڵکێکی سادەو ساکار     سەرگەرمی کاسبی و کار
دوور لە هەستی ڕق‌وقین     وەك برا وێکڕا دەژین
بەڵام ئەو گوندە گشتی     کاری وردو درشتی
تێکڕا بە نیرومەنەوە     ( ئاغا ) دەی برد بەڕێوە

لەناو ئەو گوندە جوانە     ماڵێکی خنجیلانە
بە ئارەق و ڕەنجی شان     شانیان دابۆ بەر ژیان
بەدەم بزەو پێکەنین     ژینیان کردبوو بە هەنگوین
باب بە درێژایی ڕۆژگار     ڕەنجی دەکێشا بۆ کار
کوڕیش لە لای مەلای دێ     تازە دەی خوێند ئەلف و بێ
دایك تەمەن چل ساڵ بوو     سەر قاڵی ئیشی ماڵ بوو
ماڵێکی دڵاوا بوون     هەرچۆنی بڵێی وابوون

شەوێکی ساردی پاییز     هەڵی داینێ ( مام بایز )
ئەرێ کوڕی تاقانەم     ڕوناکی ئەو چاوانەم
بەرخم ، گیانی شیرینم     ئەستێرە گەشەی ژینم
بۆ لە ڕاستی ژن هێنان     وا بێدەنگی ڕۆڵەگیان ؟
ئەمن پیرم ڕابواردووم     کوڕم تاکو ئەم‌ڕۆ بردووم
دەبا ژنت بۆ بێنم     ئەوەك بمرم ، ئەمێنم
بەقسەم بکە باوانم     با ببینم ئەوەکانم
بەو هیوایە کوڕی چاك     با سەر ئەنێمە ژێرخاك

**کوڕ :**

وامەزانە بابەگیان  بێدەنگم لە ڕاست ژیان
ژن ژیانی ئینسانە  نیوەی دین و ئیمانە
چۆن بێدەنگم باوکی خۆم  بۆ ژن هێنان تامەزرۆم
بەڵام دەمویست کەوا تۆ  دەست پێش خەی لە گفتوگۆ
دەنا دیاریم کردووە  قەولم لێ وەرگرتووە
دەتۆش هیمەت کە بابە  دڵم وەکو کەبابە

**باوک :**

ئافەرین زوویە هەستە  منیش ئەوەم مەبەستە
پێخۆشحاڵم کوڕی ژیر  گەر نەبێت بۆ ئێمەی پیر
ساز دەکات چای یاخود نان  سووکتر دەکات ئەرکی ژیان
دەی بیڵێ کوڕم کێیە  ئەو کچەی دڵت لێیە ؟!

**کوڕ :**

کچێکی نەجیب زادەیە  ناوی ( پەریزادە )یە
ڕەوشتی پاک و جوانە  هەروەك ئێمە مانانە
ڕقیشی لە زۆردارە  ڕاستی پارووی هەژارە
دەڵێ زیندەی ڕووی زەمین  دەبێ کار بکەن بۆ ژین
یەکسانن هەرچی مرۆیە  چینایەتی درۆیە
گشتی بەندەی خودایە  فەرق تەنها تەقوایە[1]
کێ پەریزی زۆر پاکە  بۆ دنیاو دین ئەو چاکە
ڕووخۆش و دڵاوایە  ئەویش کچی ئاغایە !

[1] ئاماژەیە بە ( ان اکرمکم عند الله اتقاکم ) .

**باوک :**

ئەو ئاغای دێیەکەمان ؟! … شتی وا ئەڵێی نامان
کوڕم بەندی گیانم … ڕۆشن کەرەوەی ژیانم
ئومێدی باوکی هەژار … لەو دنیای بێکەس وکار
تاقانەی خۆشەویستم … وەرە گوێ بدە مەبەستم
دەمەوێ تێبگەی لێم … بزانە کە چی دەڵێم
دڵسۆزتە باوکی پیرت … وا کەوتۆتە تەکبیرت
لەمن بەولاوە کێی دی … وا دەت دوێنێ بە هێندی
پەیزادەت بۆ نابێ … ئەگەر دنیاش خەرابێ
باوکی سەرکاری دێیە … گشت ڕای ئەوگوندەی پێیە
هەموو کاروباری دێ … بەرهەم و داهاتی نەوێ
ماندووبوونی ڕۆژو شەو … کردەی خەڵکە ، بەردەی ئەو
خەڵکیش مل کەچ و کەساس … وەک گوڵەگەنم بۆ داس
هەرچی ئاغا بفەرموێ … چی لەو ڕەعیەتە بووێ
دەست لە سنگ ڕاوەستاون … بەندەی گیپە و چەلاون
زێروون خوێنی بۆ دەمژن … ڕێگرن پیاوی بۆ دەکوژن
شەو حەرەسیی[1] لێدەگرن … لە جیاتانیدا دەمرن
ڕەخنەش دەگرن لە خواوە … چین و توێژی داناوە !
بە خوێنی چینی هەژار … هەڵدەچنێ کۆشک و تەلار
بەڵام چونکە ئاغایە … بازاڕی لەبەرمو دایە
قۆڵنجی دەشێلدرێ … ئاوی بۆ گەرم دەکرێ
تاژی ڕاوێی جل دەکەن … قەڵێتەی[2] لەمل دەکەن
باخی بۆ پەرژین دەکەن … وەڵاخی بۆ زین دەکەن
زەکاتی بۆ دەنێرن … ڕوحی خۆی پێدەسپێرن

---

(١) پاسەوانی .

(٢) ئەو قایشەی لە ملی تاژی دەکرێ بۆ ڕاکێشانی .

ئێمەش هێندە کەساسین    هێشتا دینار ناناسین
جاتوخوا بە چ جۆرێ    لە ئاغا بچینە ژوورێ ؟
یان چۆن خۆم بەرەلاکەم    داوای کچی ئاغاکەم
بەسە کورم واز بێنە    ئابڕوومان مەتکێنە

کوڕ :

بابە ژنم بۆ بێنە    دەروونم دامەرکێنە
با تامی ژین بزانم    سووکتر بێ غەمەکانم
هەستە ناوی خوا بێنە    بچۆ ئاغا بدوێنە
کچەش دڵ نادا بە کەس    تەنیا منی دەوێ و بەس
لە زۆر جێش داخوازی دێن    جگە لەوەی خەڵکی دێن
بازنە ، کەمەر ، ئەڵقە ، گوڵ    هەتا بخوازێ خشڵ
بۆی دەکەن بە زیادەوە    چونکە لایەقی ئەوەوە
بەڵام ئەو کوا دەربەستە    بەختەوەری مەبەستە !
دەڵێ تەنیا تۆم دەوێ    بانەم بێ نانی شەوێ
پارەو پوول بە بێ ئیمان    کۆت و زنجیرە بۆ ژیان
ئەوەی دڵی پێ بەستێ    بە نەفسی خۆی ناوەستێ
دواڕۆژیش پەشیمانە    بەشی خەفەت و ژانە

دایک :

. .

ئەیەڕۆ پیاوەکە    توخوا کاری مەکە
دڵی بەختیار مەشکێنە    زوو بە ژنی بۆ بێنە
بابە دڵی خۆی نیدی    ئاواتەکەی بێتە دی
مادام کچ بە دڵی وییە    تێفکرینی بۆچییە ؟

کوڕ :

ڕاست دەکات دایکم بابە    ئەی ئەتۆش ئاوابە
چیدی دڵم مەشکێنە    ئارەزووم بەجێ بێنە
چاوم لەزاری تۆیە    پیاوم شەرمم بە خۆیە

### باوک :

وەی لەعەمری منت کەوێ
بەوخوایە ڕۆژو شەوێ
لە خەیالی ئەو کارەم
چی بکەم بێ پوول و پارەم
کوڕم زۆر لە خەمی تۆم
وەك ئەرکی سەرشانی خۆم
بەس نیمەو ئاغا لە ژین
کوانێیە هاو و کوفین[1] !!
کوا چارە کوا ڕێ ڕوونی ؟
چی بکەم لەگەڵ نەبوونی ؟

### کوڕ :

بابە ژنم بۆ بێنە
چیدیکە ڕامەمێنە
دەڵێی ژنت بۆ دێنم
دەنا چیدی ناخوێنم
کە من دڵم زامدارە
دادم نادا سیپارە[2]
بابەگیان بێ تاق و جووت
سبەینێ نابێ بچیە جووت
دەبێ بۆم داخوازی کەی
دڵی شەیدام ڕازی کەی

### باوک :

بەناچار باوکی هەژار
گوڕ فرمێسکی هاتە خوار
بەوچاوە پڕ ئاوانەی
ڕووی کردە کوڕە تاقانەی
کوڕم منی بەستەزمان
بێ پوول و پارە و سامان
ئی هەم بێ پارچەك زەوی
نانەکەم لێی دەست دەکەوی
نیوەشی بۆ ئاغایە
دەوێری بڵێی بۆ وایە
ئەدی چۆن داوای ژن کەم
ژیانی خۆم لێخن کەم ؟
ئەویش کچی ئاغا بێ
پێم وا ئی یە ڕەوا بێ !!
سوور دەزانم ئەوکارە
هەر بۆ ئاغاو زۆردارە

---

(١) رفیق ، وەکو یەك ، یەکسان .

(٢) ئەم دەفتەرەی فەقێ بۆ یەکەم جار ئەلف‌وبێی تێدا دەنوسێتەوە .

**دایک :**

بەخوا ئەو ڕۆژەم جەژنە      کوڕی ئاقانەم بەژنە
با ئەم بێت پرێسکە و پاڵ      چش لە خورجین و جەواڵ
یەک ڕۆژ بووکم ببینم      جارو جەهەننەم ژینم
لە نێو ماڵ بێت و بچێ      وەرە گیانت دەرنەچێ
بانگی کەم پەریزادە      سەر لانکەی لانکێ لادە
با تێر سەیری ئەوەم کەم      لە شیرین خەوی ڕاکەم

**کوڕ :**

بەسیەتی دوا قسەیە      بۆم دەخوازی ئەومیە
دەی خێرا بە ئەسپایی      چەند کەسێک لە ئاوایی
کۆمەکە بە دەست و برد      بە نەخشەیەکی زۆر ورد
هەندێک لە حاجی زۆرزان      مەلای گوندی و فلان و فلان
مام پیرۆت و مام وەسمان      دەڵێی ئاگرن لە قسان
ڕیش سپی و کوێخای گوندی      کۆمەکە زۆر بە توندی
مام عەلیش بۆ ڕەجایی      بەلکو بێتە ڕەدایی
هەستن ناوی خوا بێنن      وێردو دوعا بخوێنن
وەکو چۆن کە سەفەرکەن      جلکی خاوێن دەبەرکەن
بەکام شێوەکە جوانە      چۆن لایقی ئەوانە
داوای کچی ئاغاکەن      تەق و تۆقێک پەیداکەن

کاتێ ئێوارە داهـــــات　　بەرەو دێ چـــــزوە ماڵات
تیشکی زێرینـــــی هەتاو　　لە کەل ئاوابـــــوو تەواو
خودای گەورەو میهرەبـــــان　　ئەخشاندبووی دنیای جـــــوان
تا چاو دەیدی گوڵزار بـــــوو　　دەستی وی تێدا دیار بـــــوو
سەد دڵـی مات و حەیـــــران　　دەکەوتە خۆشـی و سەیـــــران
جریوە جریوی چۆلەکـــــان　　مۆسیقا بوون بۆ ژیـــــان
گمەگمـــــی کۆتری شاخ　　لەدڵدا نەیدەهێشت ئـــــاخ
بە ناچار باوکی هـــــەژار　　نەی شکاند دڵـی ( بەختیـــــار )
سووڕا بەلای وەتاغـــــا　　ڕووی کردە ماڵـی ئاغـــــا

## وەتاغـــی ئاغا :

مامۆستا لە دوای نوێـــــژ　　ئاوا کەوتە وتەو وێـــــژ
خودایە بەناوی تـــــۆ　　ڕەنجمان نـــــەدەی بە فیـــڕۆ
هەرچـی لە دڵمان دایـــــە　　مەبەستمان تۆ بێ خوایـــــە
هەر تۆی لە تنۆکێك ئـــــاو　　دروست دەکـــــەی ژن و پیاو
ج ئێر بێ ج مـــــێ دیسان　　دادەنێن بنیاتـــــی ژیـــان
وەك داك و بابی خۆمـــــان　　وەچە زیادەکەن بۆمـــــان
هەر ئاوا لە دێر زەمـــــان　　پێڵا هاتووە سووڕی ژیـــــان
مەجلیسمان هەر ئی خۆیـــــە　　ئاغا قسەم لەگەڵ تۆیـــــە
هەتا گوڵ خۆی بنوێنـــــێ　　بولبول هەر بـــــۆی دەخوێنـــێ
بە کورتـی داوام وایـــــە　　گوڵێك لە باخت دایـــــە
کە بیدەی بە بەختیـــــار　　ژینی بکەی بە بەهـــــار
بەختیاری مـــــام بایـــز　　سەودای وا ئەبـــــووە هەرگیـــز

**مەجلیس :**

ئا ... قسەی مامۆستایە — زۆر لە جێگای خۆی دایە
ئاغامان بۆ بمێنێ — نابێ قسەمان بشکێنێ

**ئاغا :**

ئاغا ڕەنگی ڕووی گۆڕا — وەکو مەل لە نێو تۆڕا
لە ڕقان دەرگی شکاند — تەنها ئەو وشەی درکاند
من ئاغا ئەوان کرمانج — گەلێك لێك دوورن ئامانج !
پەریزادە و بەختیار ؟ — سەلا لە ئاقڵی خەسار
ئاغاو کرمانج تخوا کوو[1] ؟ — دەچنە یەك تای ترازوو ؟!
پەریزادە کچی منە — درکی چاوی دوژمنە
گوڵی ناو گوڵزارمە — مۆمی شەوی تارمە

بانگی نۆکەرانی کرد — ئەوانیش بە دەست و برد
بۆ ئەوەی پرسن چییە — ئایا وایە ، وانییە ؟
هەروەك گورگی شێتوهار — کەوتنە ناو خەڵکی هەژار
خوێنی مەلایان ڕژاند — دەستی مام عەلیان شکاند
سەری مام بایزی هەژار — خوێنی پێدا هاتە خوار
بێتاوانی خاك بەسەر — لێی دارسان بە خەنجەر
حاجی ڕەسوو مام وەسمان — هەڵاتن لەبەر دەسیان

---

(١) چۆن .

بەختیار :

پەشیمانم بابەگیان     بم بوورە تو بی قوربان

شەرتە تا لە ژین مابم     چونی تو بلێی وابم

دلتان نەشکێنم هەرگیز     بابەگیان دایکی ئازیز

دەبێ قزلیش هەلمالم     بو نەهێشتنی زالم

تا خوێن لە برین نەچوڕێ     چون باری ژیان دەگوڕێ ؟

بەلێن بێ نەدەم وچان     نەوەستم دەستەوەستان

هەتا خوا بگرێ بالم     چینی زوردار ڕامالم

تا دادی خوا دێتەوە     ئەو تەمە دەستڕێتەوە

پەریزادە :

تەنها یاسای خودایە     کە یەکسانی تێدایە

خوایە بو نیمەی هەژار     یاسای تو بێتەوە خوار

هەرچی بە ڕووی دنیاوە     مافی خوی پارێزراوە

مافی ئافرەتی داماو     مافی پیرو گەنج و لاو

بەلێن بێ هەتاکو هەم     تا ئاخرین هەناسەم

منی کزیلەی دل بە غەم     دیلی ناو کوشکی ستەم

پشتم بە خوا ببەستم     دژی زوردار ڕاوەستم

پیرالشار    ٤ / ٦ / ١٩٩٠

# ولاتەکەم [1]

ولاتەکەم
لەودیوی سنووری دەستکرد !
لە شاری غوربەت و غەمدا
چاوم لێتە ...
وەکو قەندیل ، وەك هەندرین ، وەکو ئەزمەڕ
سەرت بەرزەو
دڵی لەرزۆکی دوژمنان
لەژێر پێتە ...

ولاتەکەم
هۆ ولاتی زۆنگەو بژوێن ....
زۆر لەمێژە بەناهەق
لە چاوانت ئەسرین[2] دەڕژێ و
لە لاشەکەت
دەتکێ خوێن ...

ولاتەکەم
وەك چۆن لێوار بێزار نابێ

---

(١) لە یادی بۆمبابارانی ئاسمانی و زەمینی ئەمریکا بۆ سەر عێراق .
(٢) فرمێسك ، ئەشك .

لە دەست شـەپۆلـی بەهاران ...
وەك چۆن قەندیل بێـزار نابێ
لە ڕەهێڵـەی شـەسـتە باران ...
وەك چۆن تاڤگە لە قەڵـبەزەی
خوڕەی ئاوا ...
وەك چۆن گلێـنـە لە تروكانـی
پێڵووی چـاوا ...
منیش هەرگیـز وڵاتەكەم
تا دوا تەمەن ...
لە تۆی وەتـــەن ...
بێـــزار نابـم

وڵاتەكەم
كەو چەندە چیای خۆش دەوێ
هێنـدەی كورد ئازادی دەوێ
خۆشـم دەوێ ...
چونكەدڵـی ماندووی عیشـقم
هەموو كاتـــێ
پێدەســرەوێ ...

وڵاتەكەم
هەركە ناحەز تۆیان ناســـی ...
چاوی تەماعیـان تێت بڕی

کردیانیە میدالی نەوت و
بە ملی ستەم کارێکدا
هەڵیان واسی ...

وڵاتەکەم
دیاری ئەورۆ ...
بۆ منداڵی چاوگەشی
تۆ ...
شریخەی پاطریۆتە دێ و
دەنگی چەکی تازەیە ...
بۆ دایکی دڵ بەخەمی تۆ
بەرگی ڕەشە ، کفنی سوورە
تەرمی ڕۆڵەو جەنازەیە ...

٢٩ / ١ / ١٩٩١ سەرنەشت

# کوردێک

کوردێک خاوەنی بەرنامەی خوابێ
لەسەر بوونی خۆی شەهیدی دابێ
شەرمە بە دوژمن غیرەت بفرۆشێ
با هەر هاوڕازی ئەشکەوت وچیابێ

کوردێک خاوەنی خاک و وڵات بێ
عاشق و شەیدای ڕەنج و خەبات بێ
شەرمە لە بڕوای دابەزێ مادام
لەخوا چاوەڕێی ڕۆژی نەجات بێ

کوردێک خاوەنی یاسای قورئان بێ
هەر تەنهاعەبدوبەندەی یەزدان بێ
شەرمە پشتی خۆی بەم و بەو بەستێ
بۆ ژینێکی کورت ئەسیری نان بێ!

کوردە هەستە کەر هەڵت کەرەکە
بخوێنە ئەکەر حەڵت کەرەکە
هۆنراوەی (هێرش) بکە کوێ ئەکەر
بەختیاری کورد و کەڵت کەرەکە

٢٧ / ١١ / ١٩٩١ دێڵەزە

# بەرزی خاڵ

وڵاتی من چەند شیرینـــــی
مەکۆی هەزار مەموزینـــــــی
ئەتۆی بەهەشـتی ســـەر زەوی
سـەری زۆردار دەکـــەی نەوی
هەوێنـــی شێعرو هەڵبەســـتی
بیرکردنەوەو سۆزو هەســـتی
مۆمـی ناو تاریکی شـــەوی
ئەوەی لێت دەگەڕێم هـــەوی
دەیان ســاڵە عەوداڵتـــــم
ئەوینـی مانگ و ساڵتـــــم
جێی خواپەرسـتی و ئاینمـــی
چـرای نـــاو تاریکی ژینمـی
دەبا هەر دەربـــەدەر بکرێـم
تا شـاعیر بم بـــۆت دەدوێـم

دیلـــزە ۲۹ / ۱ / ۱۹۹۲

# لەوەتی من وەبیــرم دێ

لەوەتی من وەبیــرم دێ
کاســەی ســەرم
جێی بـارووتی ئەژدەهاکـی
گەرووی تفەنـگە ...
ژیان تـاڵـــەو
ڕوبارێـــکــی بێشـە پۆڵـــی
تینـــــووی مەرگـــــە

لەوەتی من وەبیــرم دێ
چەوســانەوە ، گرۆگاڵــی لەسەر زاری
منداڵانــی کوردســـتانە ...
دڵــی تەنگی هەتیوەکان ،
خانووی ماڵــی ئاوارەکان ،
شـــەوەزەنگــی گۆڕســـتانە ...

لەوەتی من وەبیرم دێ
بە زمانی تفەنگ دەدوێم
کەچی هێشتا بێئالامەو
کانیەکی ڕوون شک نابەم
وەکو جوتیارێکی ماندوو
پێیدا نووسێم ... !

لەوەتی من وەبیرم دێ
چینی هەژار ...
شەو تا بەیان
مرواری فرمێسکی چاویان
دەهۆننەوە
بۆ گەورەی شار ...!

٢٩ / ١ / ١٩٩٢ دیلیژە

# هۆ فریشتە هەق ویستەکان [1]

ئەو جارەیان وڵاتی مـــــــــــــن
دارەمەیتێکی سـامناکـــــــــــــە
ماڵ ئاوایی و کفنی ســـــــــوورە
فلیمێکی زۆر غەمناکـــــــــــــە

ئەو جارەیان هەولێری کـــــــورد
بوکی ناکامی ڕەشپۆشـــــــــــە
شـارەکەی ( ئەحمەدی خـــــانی )ش
وەک مزگەوتەکان خامۆشـــــــــە

هۆ فریشـتە هەق ویسـتەکـــــان
دڵ وێلە بەدواتانــــــــــــــەوە
ئێوە ئاواتی ئەو گەلــــــــــــەن
توخوا کەی دەگەڕێنــــــــــەوە

ئەی نازانن ئێوە بـــــــــــــڕۆن
ئاسـودەیی گەل بار دەکـــــــات
خەڵک سـەراسـیمە دەبێـــــــــت
ڕوو لە ئاسـۆی نادیار دەکـــــات

---

(١) لە یادی ئەسکۆی بزوتنەوەی ئیسلامی و ئومێدبەخشین بە هەستانەوەیەکی زوو

ئەگەر ئەمجارە بێنـــــــــــــــەوە
سـواری شـەپۆلـی خوێن دەبیـــــــــن
جووتە هەڵۆی ( کێـــــــــــوەڕەش )و
شـاسـوارەکەی ( بیتوێن ) دەبـــــــین

گەر بێنەوە شـاری قولـــــــــــــە
نابـێ داسـتانێکی پەسـت بــــــــێ
وەک سیمای قورئانی ســــووتـــــاو
خۆڵەمێشـێکی بێهەسـت بـــــــــێ

توخوا ئەم جارەش وەرنـــــــــــەوە
غەمخۆرەکانی گوندو شــــــــــار
ئەسـپی عەلـیو عومەر تــــــــاودەن
( ســـوار تا نەگلـێ نابێ بەســــوار )

دیلـــزە ( ١٩٩٣)

# نیشتمان وخەیاڵی نەزۆك

نیشتمانم ، وڵاتەکەم
کوورەی ڕەنجو خەباتەکەم
تۆ کاتێ گەر بەختەوەری
من دێتەدی ئاواتەکەم

نیشتمانم ، ئەی ئازیزم
وەکو چاوم دەت پارێزم
گۆڕەپانی چەکی تازەی
لە سایەی ئیمپریالیزم

نیشتمانم ، جێی شانازی
ئەی چەند وێران و بێنازی
خەون و خەیاڵی نەزۆك بوو
ئەو کەسەی دوێنێ پێت نازی

ئەو وڵاتە جوان و پاکە
ئێستا وەك مردن سامناکە
چارەنووسی نادیارەو
خەڵکەکەی هەموو غەمناکە

کۆرپەی کوردم چەند بێنـــــــازە
لە ژێر ڕەحمی چەکی تـــــــازە
چوار چێوەی ژینیان کێشـــــاوە
فرمێسك و مەرگو جەنـــــــازە

گوێ بگرن لە پەیامەکـــــــەم
دەی‌خوێنمەوە ناسنامەکـــــەم
ڕێکخراوی مافی مـــــــرۆڤ
هانــێ سکاڵای نامەکـــــــەم

من کە عەودالی ئەو کێـــــوەم
دەنگی قورئانم بەرنیســـــوەم
خاوەنی کیمیـــــاو ئەنفالـــی
شاگردەکەی دەستی ئێـــــوەم

٨ / ٥ / ١٩٩٤ قاســمەرەش

# بۆ شەهید ئازاد (١)

دیسان قەندیلی مەکۆی غەم
هاواری ئازیزێکی
تری ئەو ناوەم بۆ دێنێ ...
دیسان ڕەشەبای ناوەخت
دڵڕەقانە ،
باخی بەختەوەری ژینم
دەژاکێنێ ...
لەگەڵ سیوادی سپێدەی
گەڕانەوەی ئاوارەیەك
تەتەری ناخۆش خەبەرم
مژدەی تاڵی ماڵئاواییم
بەبن گوێدا دەچرپێنێ

دیسان ئاسۆی بەرزی هیوام
وەك ڕەهێڵەی سەری قەندیل
گەردەلوولەو
لەمن لێڵ و سەربەتەمە ...

---

(١) لە یادی شەهید ابراهیم مصطفی داود ناسراو بە کاك ( ئازاد ) کە
لەدوای شەهیدکردنی لەلایەن مەرزەبانانی ئێرانەوە لاشەکەی نزیکی چل ڕۆژ لە بناری قەندیل
مایەوەو لە کەسیان ئاشکرا نەکرد .

دیسان جارێکی تر پێشدەر
شانۆیەکی مەرگەساتەو
تازیەدارو دڵ بە غەمە ...
ئەوجارەیان
دیمەنیناو ڕووداوەکە
تراژیدیایەکی خەستە ...
هێند سامناك و غەم ئامێزە
پاڵەوانی چیرۆکەکەش
لە ڕوودانی وەها پەستە ...
کارەساتە ،
شانۆیەکی پڕ هەیبەتە ...
ڕێو ڕەسمی بەخاك سپاردنی
جەنازەی بێدارەمەیتە ... !

هۆ شەهیدی بێدەنگ وباس ...
هۆ فریشتەی ،
چیا زادەی ماندوونەناس ...
ئەو کەسەی بۆ ئافەرینی
خوێنی ناهەقی تۆی ڕژاند ...
ئەو کەسەی دەرگای ئومێدی
گەڕانەوەی تۆی شکاند ...
باش بزانە ،

دەیەها (شەوبۆ)[١] و (نێرگز)[٢] ی بۆ بەهاری سەرکەوتن
لە ڕێی تۆی پێشمەرگە ڕواند ...

قەندیلەکەی سەرسەختی کورد
وەك لەم وڵاتە غوربەتە
ئاهی غەریبیم بت گرێ ...
کەی قەرار وابووە شەهید
لەسەر سینگت ،
چلە بگرێ ...
چلە بگرێ ...

٢٤ / ٦ / ١٩٩٤ میلزە

---

(١ و٢) ناوی دوو منداڵی شەهیدن .

# سەگێکی بێ پەنا

بۆ حەسانەوە لە هەر جێگایێ
ئەگەر تۆ ئەت بوو ماڵ و پەنایێ
خزم و ئاشناش لە بەهانەیە
هەڵوێستی دۆستیش وەک بێگانەیە !
لەسەر ئەم شێعرەی کەوا دامناوە
ڕووداوێکی وا لێرە ڕووی داوە[1]

ڕۆژێک لە ڕۆژان زستان بوو ، بەفر
چلوورەی بەستبوو لە سواندەو کەپر
لەو چەند دوکانەی کە لەم ناوەبوو
تەنها دوکانی ( خدر )[2] کراوە بوو
دووکەڵی سۆبە لەسەر هەر بانێ
چڕە دوکەڵی دەچۆ ئاسمانێ
ئۆردوگا دەت گوت تۆپخانەی شەڕە
خەڵک بێکارە بێ بزن و مەڕە
جارجارە ژنێ بە حاڵە حاڵێ
زبڵەکەی دەڕشت لە سیا چاڵێ

---

(١) ئێران - پیرانشار - ئۆردوگای دیلزێ .
(٢) خدر حاجی رسول پشتاشانی .

کورج تەنەکەی دەنا سەرشانی
بە پەلەپرووزە دەچۆوە نوانی[1]
لە ( مەلاناظم )[2] ترسیان نەبا ژنان
دەرکی ماڵیمە دەبۆ زبڵدان
لەپڕ لەولاوە ( فەقێ برایم )
کردی بەهەرا بە دەنگی قایم
دەی یاڵێ کاکەبە بێ وەستان
باکوتەک[3] بەرین بۆ ڕێی ناودەستان
دەیگوت ئەوە قسەی پێشینەکانە
زستان یەک ڕۆژ بێ هەر بێ نامانە
زۆری پێخۆش بوو چونکە دەیزانی
زۆربان برسییە کەرویشکەکانی

ئەوجار ( مامە حمەد )[4] لە خەوێ هەستا
لە پێش دوکانی کەمێک ڕاوەستا
دەبێ منداڵ چۆن بکەنە دوکانێ ؟!
منداڵیش نەبن بازاڕی کوانێ ؟!

---

(1) ئەو شوێنەی کە باران نەی گرێتەوە
(2) ( مەلا ناظم ) ئاغجەلەری کە لێپرسراوێکی تایبەتی ئەوکارە بوو لە لایەن دەوڵەتەوە .
(3) ڕێگایەک کە بە لادانی بەفر بکێشرێت .
(4) (احمد ابراهیم ) وەرتی ، پیرەمێردێکی دوکانداری ئۆردوگاکە بوو .

بەناچاری ڕووی لەماڵ کـــــــــــــردەوە
بەس سەرمای لەگەڵ خۆیـــدا بـــــــردەوە

جا ( مام مستەفا )[1] هاتە دوکانـــــــــێ
بەڵکو پەیداکات پێنج شەش قڕانــــــــێ
زۆر بە دوو دڵــی دەهاتو دەچــــــــوو
لە بێ بازاڕی هیــچ کەیفــی نەبـــــوو
لە پڕ منداڵێک ، سەر بە کلێتـــــــــــە
حەتمەن یان بۆ خۆی یان بابــی شێتــــــە
نەگینا توخوا کەی بەم سەرمایــــــــە
وەختــی دوکانــی مام مستەفایـــــــە ؟!
دەســتی بردەوە گیرفانـــی شـــــــڕی
بایــی پێنج تــومەن شەکرۆکــەی کـــڕی

نازانم چۆن بوو ئەم دی ( کۆســـــــاری )[2]
هەڵ لەرزێ لە بن سیلەی دیـــــــواری
دەنا مشـــتەری ڕۆژان و شـــــــەوە
کاسبی ( نەبەز ) بۆ زگــی نـــــەوە

---

(١)( مستەفا وەرتی ) ناسراو بە مستەفا سوور دوکاندارێکی تری ئۆردوگاکە بود .
(٢)( کۆساری نەبەز مستەفا ).

سەرم هەڵهێنا دیـــتم لەمـــــــــــــــڵاوە
منداڵ دەورەیـــان لەســـــــــــــەگێ داوە
وا ڕاوی دەنێن لەســەر ئەو بەفـــــــــــــرە
خەڵک هێند زۆرە وەک ڕۆژی حەشـــــــــرە
سەگی بەستەزمان چاری نەمـــــــــــــاوە
بۆ ناو نۆردوگا پەنـــای هێنـــــــــــــاوە
منداڵ وا هەر دێن دەســـتە بە دەســـــــتە
لە ژیانی سەگدا ڕۆژێکی ســـەختـــــــــــە
هیچ کەس لە کاتی بێ دەستەڵاتــــــــــی
نامانج ناپێکــێ بۆ ڕێی نەجاتـــــــــــــی
بۆیە سەرەنجام بە ناعیــلاجـــــــــــــــــی
هات خۆی هاویشـتە ماڵی ( مام حاجـــــی )[1]
بەچاو تروکانـــێ هەرچی منداڵـــــــــــە
لە دەوری ماڵـی مام حاجـــی نــــــــاڵ
یەکێک تۆپەڵـە بەفری خڕ دەکـــــــــــرد
بناگوێی سەگی ساردو سڕدەکـــــــــــرد
یەکێک دارێکی گورج ڕادەوەشـانـــــــــد
ڕێک دە کەلەکەی ســەگی دەسرەوانـــد

[1] ( حاجی سمایل ) : پیرەمێردێکی بەساڵاچووی نۆردوگا بوو ، لە جەور جۆڵی منداڵ زۆر سەخڵەت بوو هەمیشە ئەو جێگایەی بە دڵ بوو کەمنداڵی لێ نییە .

مام حاجی‌زانی ئەوە بەڵایە
دەرەقەتی کشت ئەو خەڵکەش نایە
بۆیە هاواری بۆ مامۆستا[1] برد
بۆو کیروکرفتە ڕاویژی پێ‌کرد
کوتی مامۆستا بۆ خاتری قورئان
وەڵڵاهی ناوم کەشتۆتە نیسکان
بچۆ مزگەوت وەک ڕۆژی جومعە
وتارێک بدە دەربارەی سومعە
هەتا کار لە کار نەترازاوە
تا پیاوەتیمان لە دەست نەداوە
لە دەستی منداڵ هەموو بێزارین
مێملی دەرکەو دارو دیوارین
بڵێ منداڵ کەمی کارێکی خێرە !
خاوەنی منداڵ وەجاخی کوێرە !!

ناهەقی نەبوو حاجی سمایل
بە قسەی هیچ کەس نەدەبوو قایل
دەی کوت وەڵڵاهی ئاخیر زەمانە
چیمان بە سەردێ خراپی خۆمانە
سەگ بۆ دەرکی من پەنای هێناوە
زمان بەستەیە ولێشی قەوماوە

---

(١) مامۆستا ( عبدالله ی وەرتی ) ، خوتبەخوێن و پێش نوێژ کەری مزگەوتەکە بوو .

دەبکشێتەوە وازی لێ بێنن
بەدارو کوتەک پشتی مەشکێنن
ئەگەر بەلەکی کەسی گرتووە
یان قەلو قازی کەسی خواردووە
هەتاتۆڵەتان بۆ لێ بستێنم
بەم کۆڵکەدارە دەمی بشکێنم
ئاخر چۆن بەخۆم بڵێم پیاوم
منداڵە وردکە دەورەیان داوم
دەڵێی لەشکری جندو شەیتانن
قسەی گەورەکان بە هیچ نازانن

بەو دەنگە دەنگو هەرا هەرایە
جیرانەکەی تر هاتە بێڵایە
لە درزی دەرگا سەری هێنادەر
بە گوێی دا چرپا زەنگێکی خەتەر
خێزانی بانگ کرد کەویش لە دەرکە
هەراسان بوو بەو دەنگە دەنگە
کوتی ئەو خەڵکە وا خرۆشاوە
حەتمەن شەڕێکی گەورە ڕوویداوە
ئادەی ژنەکە دەی ڕامەمێنە
ڕاکە بۆ ژوورێ بەرچیخەک[1] بێنە

(١) ئەو دارەی چیخی پێ ڕادەگرن بۆ هەڵدانی ڕەشماڵ .

خێزانی کاتێ گوێی لەبەر چیخ بوو
قووڵ دە خەیاڵی لاویەتی ڕاچوو
گوتی پیاوەکە هەی بابان وێران
بەر چیخ کوا ماون وەک جاری جاران
کوا مەشکەو سەرپێک[1] ، کوا چیخو تاوڵ[2] ؟
کوا ئەستوندەکەی [3] ڕاست وەکو شاوڵ
من کە ژنێکی ڕەشماڵ نشینم
کوڵاندتنەوە کۆنە برینم
من تا جحێڵ بووم کچی ماڵێ بووم
هەر شەو لە وارێ [4] لە کۆی نواڵێ بووم
کابانێک بووم من بۆ سەد سەر مەڕی
نەمدەزانی ژیان چۆن تێدەپەڕی
لەنجەم وەک لەنجەی تاوس و پۆڕ بوو
تاوڵ و ڕەشماڵم هەشت نۆدە پۆڕ بوو
گەر مەیلم لێبا بەسیلە چاوێ
سەدانی وەک تۆم دەخستە داوێ

---

(١) سێ‌دارن بە شێوەی سێ‌گۆشەیەك سەرەكانیان لە سەرەوە دەبەستن و مەشكەیان پێدا هەڵدەواسن .

(٢) ڕەشماڵ .

(٣) كۆڵەكە .

(٤) هەوار .

ئاخ ئەگەر ڕۆژێ لێم دەبووی میوان
ڕێزم زۆر گرتبای وەک دابی کوردان
جا دەت دی کە چۆن بە دەستو بردی
بەشیرێژە ڕۆن [1] بەڕێم دەکردی
ئەو کاتە شێرە ژنی ( ئێران )[2] بووم
ڕەفیقی سوێسکەو کەو و پۆڕان بووم
هەر لەو وەختەوە کەپێ هەڵاتووم
بە ئاوو هەوای کوێستان ڕاهاتووم
لە زۆنگە وبژوێن مەڕم دۆشیوە
منم سروشتی جوانی خوام دیوە
شەنگەبێری بووم مەڕم سەردەدا
ئاگرم لە جەرگی شوان بەردەدا
ئێستاش کە عومرم سەر بەرەو ژێرە
لە بێتاقەتی مووم پێ بسپێرە
ئانا ئێستاکەش لەسەرە خۆمە
ئێچیری دەستی پیرە هەڵۆمە !

(۱)خواردنێکی بەتامو خۆشی کوردەوارییە ، بریتییە لە سوورکردنەوەی شیرێژ لەناو ڕۆن دا .
(۲) ئەو ژنە ئێرانییە کە مێردەکەی عێراقییە کە لەمەودوا دەکەونە گفتوگۆ ، هەریەکەیان باسی لاویەتیخۆیان بۆ یەکتری دەکەن ، لە نوسخەی ئەوەڵ جاردا ناویان هاتبوو بەڵام لەسەر داوایخۆیان لەهێنانی ناوەکەیان هۆمان بوارد .

ئەوجار مێردەکەی ناوڕێکێن داوە
وەڵامی ژنی بەم شێوە داوە
ئافرەت دەزانم هاوسەری منی
بەشداری غەم وکەیسەری منی
تۆی لە گشت خۆشی وناخۆشی ژیان
هاوبەشیم دەکەی بە دڵو بە گیان
کەسێکم نییە دڵی پێخۆش کەم
غەمی ئاوارەیی پێ فەرامۆش کەم
وەرە پێشەوە با دڵت کاس کەم
تا منیش ژیانی خۆمت بۆ باس کەم
کوڕە لاوێک بووم بە ڕووی دنیاوە
غەمو خەفەتم گشت نابۆ لاوە
فەتاح پاشا بوو دەم کردەبەرم
شەدەو دەسماڵم دەنایە سەرم
شۆڕە سواری بووم دەچوومە ڕاوێ
هەر ئاسکە کێویم دەکەوتە داوێ
بۆیە هەر کاتێ دەردەچووم لە ماڵ
دڵیان لای من بوو دەستەی کچوکاڵ
خەنجەری دەبان دەسبیحی بەسەر
دەستم لەسەر بوو ڕۆژانی خەتەر
یان ڕانکو چۆغەم کە دەکردەبەر
دەیانی وەک تۆم دەکرد سەوداسەر

کەواتە ئافرەت هەر بۆیەک چاکیـــــن
قسەمان یەکە و لە خەڵک بێباکیـــــن
تۆ شەنگەبێری و من شۆرە ســــــوار
پیرۆزی یەک بین یاخوا هەزارجـــــار

وا سەرگەرم بوون بەم گـفـتوگـــۆوە
ماڵی مام حاجی لە بیریان چـــــۆوە
کاتێ کە هۆشیش هاتەوە بەریـــــان
هیچ کەس نەمابوو لە دەوروبەریـــان

ئەگەر ئەو سەگەش ئاوارە نەبـــــا
لە خاوەنـــی خۆی غـەوارە نەبـــا
کێ دەیتوانی تەنانەت جـــــارێ
بگرێ لەم سەگە بەردێ یـــان دارێ
مرۆڤ گەدایە یا شانشیـــنـــــە
هەر لە وڵاتـــی خۆیدا سەنگینـــە

دێلـــــزە ١٩٩٧

# رۆژی سەرکەوتن[1]

١

چ دەبینم ؟
لەم وڵاتە ، بەم زستانە ...
لە گشت کوچە[2] و خیابانی[3]
گوڵبارانە ...!
هەموو ساڵێ لەو کاتەدا
گوڵ و بەفر پێکەوە دێن ...
کەچی هێشتا خۆشەویستن و
لە دڵی خەڵکا هەر نوێن ... !

٢

سڵاو ئێران
ئەی وەتەنی ئاوارەکان ...
بیدە بە گوێچکەی عالەما
ڕازو نیازی هەژارەکان ...
بخوێنەوە بە جیهانا
پەیامەکەی بێمرادمان ...
ئێمە کوردین هەموو ڕۆژێ
یادی سەروەرانمان هەیە
نازانین کام ڕۆژە ناو بنێین
ساڵڕۆژی بوون و یادمان ... ؟!

(١) لە یادی ( ٢٢ )ی ڕێبەندان ، ساڵڕۆژی کۆماری ئیسلامی ئێران ، لە بەرانبەر حەشامەتێکی زۆری شەخسی و دەوڵەتیدا خوێندرایەوە .
(٢) کۆڵان .
(٣) شەقام .

سڵاو ئێران
میوانخانە ئاسوودەکەم ...
بیدە بە ڕێکخراوی مرۆڤ
پەیامەکەم ...
پێیان بڵێن لەوڵاتی ھەم
بێ ئالامە ،
سەدو ھەشتاو دوو ھەزار ئەنفالە
ناسنامەکەم ... !
پێیان بڵێن :
من ئەندێشەی پەنابەرێکی بێ پەنام
شەو تابەیان کە بە یادی گەڕانەوە
خەو دەبینم ...
پێیان بڵێن :
من حەماسەی جەزائیرو
بورکانێکی ڕاپەڕینم ....
پێیان بڵێن :
باوەڕدارم ،
ئەمن یەکەمین چەخماخەی
ھاوارەکەی فەلەستینم ....
پێیان بڵێن :
من پڕ بەدڵ ھاواردەکەم
مسوڵمانم ... موسڵمانم ...
بۆیە نییە ،
لەسەر ڕووی نەخشەی جیھانا
ناونیشانم ... ! ناونیشانم ... !

١٩٩٨ دیلـزە

# گوێز و شوتی

گوێزت نەدیوە چەند خڕو تــــــــەرزە
کەچی دارەکەی چەند درێژو بــــــەرزە

بەڵام لە شووتی و بڕکی بڕوانــــــــــە
گەڵای چەند وردو ڕاکشاو و پـــانـــــە

گەر گوێـز شووتی بێو وسـەرت کـــەوێ
ئەوسا هێزی خوات بۆ دەردەکـــــــەوێ

١٩٩٨ دێڵــــزە

## مەتەڵ ( ١ ) [١]

مەتەڵ شەش پیتە پێنج نوقتەی هەیە
ناوی شاخێکە بزانە کامەیە ؟

بۆ سەربەستانی وڵات مەکۆیە
لانەی هەزاران پیرە هەڵۆیە

زۆر پەنابەری حەواندۆتەوە
ماندووی ڕێی دووری حەساندۆتەوە

زۆری وەبیر دێن نسکۆو بەرخۆدان
بوونە ئەفسانەی دەوری ئاگردان

دووو بڕگەی هەیە واتە دوو بەشە
( د )ال لەو نێوەندە پیتی هاوبەشە

بەشی یەکەمی شیرینی ماڵە
بەشی دووەمی ژنینکی تاڵە

چیای قەندیل

---

(١) ئەم مەتەڵە لە گۆڤاری هەڵوێستی ژمارە ( ١٩ )دا بڵاوکراوەتەوەو کاک ( احمد باپیر ) خەڵاتی مەتەڵەکەی بە نسیب بووە .

# مەتەڵ ( ٢ )

مەتەڵی ئەوجار ڕێبازی ژینـــــــــە
مایەی بەختیاری خەڵکی زەمینــــــە

شەش پیتی هەیە بە ئیملای کـــــوردی
ئەگەر نەیناسی بە کافر مـــــــردی

ئەگەر لە نوسەر خۆت نەکەی زویـــــر
دوو نوقتەی هەیە هەوەڵ تا ئەخیـــــر

پیتی ( دوو ) بە دوای ( سێ )دا کە بێنی
ڕۆژەکانی مانگ زوو بە دەست دێنـــی

پیتی ( سێ )ش لە دوای پیتی( دوو ) بێنە
بەسەر ئەخۆشدا ( یس ) بخوێنـــــە

( رئیس )ی بێ ( ر )ا بهێنە بــــۆ ( لام )
بە سووك و ئاسان دەردەچـــــێ وەڵام

(وەڵام/ئیسلام)

هەولێـــر ٢٣ / ٤ / ١٩٩٩

# نێوەڕۆک